*کتێب: فەرهەنگی نوێ

*ساڵی ١٩٨١ کراوە بە کوردی

*بۆ دانانی ئەم کتێبە سوود لە نووسینی ئەم نووسەرانە وەرگیراوە:

-داریوش ئاشوری، دکتۆر بەهائەددین پازارگاد، روزبە کە بە فارسی ئامادەیان کردووە.

*بورهان قانع /کردوویەتی بەکوردی.

*نەخشەسازی/ خالید محەمەد

*چاپی یەکەم/ چاپخانەی (ËÏÇæÍáÇ) بەغدا-١٩٨٥.

*ژمارەی سپاردن/ ( ٥٦٦ )ی ٢٠٠٢ی پێدراوە.

*چاپی دووەم/ چاپخانەی قانع- ٢٠٠٣

نرخی پانزە دینارە

**پێشکەشە بە ئەو کەسانەی:**

# لە فەرهەنگی نوێ تێدەگەن..

**بورهان قانع**

## پێشەکی:

جگە لەوەی کتێبخانەی کوردی پێویستیی بە کتێبێکی وەکو "فەرهەنگی نوێ" یان فەرهەنگی "سیاسی" هەیە، گۆڕینی بەرهەمو داهێنانی نوێش یەکێکە لە هۆیە گرنگەکانی هاتنە کایەی چەندان زاراوەی تازە لە ڕۆژێکدا، هەروەکو تیۆریزانێکی بەناوبانگ!! ئەوەی سەلماندووە کە بە هۆی داهێنانی نوێو گۆڕینی باری بەرهەمەوە، زمانێکی یەکگرتووی جیهانی پەیدا دەبێ، بەڵام کەی؟

ئەو زاراوانەی ئێستا پێی ئەدوێین تا ڕادەیەك بوونەتە هۆی ئەوەی زمان سنووری سەدەیەك لەمەوبەر بشکێنێو ڕوخسارێکی تازە بکاتە بەر. گەلێك زاراوەی تازە هەیە –بەتایبەتی سیاسی- کە لە زۆر کاتو شوێندا بەکاردێنو زۆر کەس لە بیسەران -بەتایبەتی ئەوانەی لە ژیانی شارستانێتیو تەکنیکی سەردەمەوە دوورن- لێی تێ ناگەن.

حەزم دەکرد توانای ئەوەم هەبێت فەرهەنگێکی -وەکو ئەمەی لەبەر دەستایە- ڕێكوپێك تر بکەمە دیاریو پێشکەشی کتێبخانەی کوردیو خوێنەرانی کوردی بکەم، هەرچەند ئەم کارە کاری تەنیا کەسێك -بەتایبەتی من- نییە، بەڵکو کارێکی هەرەوەزیانەی چەند کەسێکی بە توانایە لەم بوارەدا، بەڵام ئەوەندە ئەم کارەم بە پێویست دەزانی، گۆڕینی ئەم فەرهەنگەم بە کوردی کردە بەشێکی دەرکەوتووی ئەو پرۆژە ڕۆشنبیرییەی کە بە دەستمانەوەیە، ئەمەش بەو نیازەی خوێنەری کورد بەڕێزەوە سەرنجی بدەنو سوودی لێ وەربگرن.

ئەم فەرهەنگە؛ ڕۆزبێ بە فارسی ئامادەی کردووەو منیش لە فارسییەکەوە کردوومە بە کوردی، جگە لەوەش چەند زاراوەیەکی تریشم لە چەند سەرچاوەیەکی ترەوە وەرگرتوە* پێویست بە دەستنیشان کردنیان ناکات، ئەوانیشم تێکەڵ بە زاراوەکانی ڕۆزبێ کردووە.

لە هەندێك شوێندا، چەند ڕستەیەکمان لە نووسینەکانی ڕۆزبێ لابردووە، ئەوەش هەر یەکەی لەبەر هۆیەك بووە، پێم وایە خوێنەرانی کورد لەم بوارەدا گلەییم لێناکەن.. ئەگەر زاراوەیەك یان چەند زاراوەیەکیشمان نەکردبێتە کوردی، ئەوەش دیسان بێ مەلامەت نییە.

هیوام وایە خوێنەرە بەڕێزەکان بە چاوی ڕێزەوە سەیری بەرهەمە پڕ لە کەمو کورتییەکەمان بکەن..

**بورهان قانع**

١٩٨٤

* لەگەڵ هەندێك لە نووسینەکانی داریوش ئاشوری، د.بەهائەددین پازارگاد.

**★ئاپارتاید – Aparteid**

وشـەیەکی ئینگلیزیـیە، بـە شـێوەیەك لـە درندانەتـرین شـێوەکانی جـیاوازیی ڕەگەزایـەتی دەڵێن.. بریتییە لە سیاسەتی جیاوازیی ڕەگەزپەرستییانە، کـە ڕەگـەز پەرسـتەکانی کۆمـاری ئەفـریقای خـوارووی لـە دژی زۆربـەی دانیشـتووان –کە ڕەش پێستو هیندین لەو وڵاتەدا– بەکاری دەهێنن.

لـە ڕووی زانسـتی زمانـەوە ئـەم زاراوەیـە بـە مانا لەتکردنو جیاکردنەوە دەگەیەنێت، ئاپارتاید (Aparteid)واتا جیاکردنەوەی ئەو خـەڵكو ڕەگەزانـەی کـە سـپی پێست نـین، ناچـارکردنیانو نیشـتەجێکردنیان بـە ناچـاری لـەو شوێنو ناوچانەی کە بۆیان دادەنرێت.. بێبەش کردنـیان لـە هـەموو مافـێکی سیاسـیو خوێـندنو پێشـکەوتن. ئەو شوێنانەی کە بە زۆر بۆیان دیاری دەکرێت تیایا نیشتەجێ بکرێن توانای لێ دەرچوونیان نابێت. تەنانەت پێداویستییەکانی ژیانیان بۆ دابین ناکرێت.

لـە ئـەنجامی ڕاپـەڕینی خەڵكو هەروەها هەڵوێستو کرداری خەڵكو دەوڵەتە پێشکەوتووەکانی وڵاتانی ئاسیاو ئەفریقا، ئاپارتاید بە شـتێکی نائاسـایی ناسـراوە، دەزگـای نەتـەوە یەکگـرتووەکان چـەند جـارێك ئاپارتـایدی بـە کـرداری دژی مـرۆڤ دانـاوە، بەڵام بە هۆی سیاسـەتی دەوڵەتـە ئیمپریالیسـتیەکانەوە –کـە خـۆی لـە خۆیـدا ڕیشـەو سەرچاوەی ڕەگەز پەرستییە– لە زۆربەی ئەو شوێنانەدا کە دەسەڵاتیان تیا هەیە ئەم سیاسەتە نالەبارە بەردەوامەو کاری پێدەکرێت.

**★ئیئتیلاف - Eieitlaf**

یەکگرتـنی کاتی ڕێکخراوو کۆمەڵە سیاسییەکانە لە پێناوی بەدەستهێنانی ئامانجی پارلمانیو هەڵبژاردندا. لەو ڕژێمە پارلمانییانەدا چەند ڕێکخراوو کۆمەڵێکی سیاسی یەکدەگرن کە هیچ کامێکیان بە تەنیا توانای بە ئەنجام گەیاندنی ئارەزووی سیاسیی خۆیان نییە.

ئیئتـیلافی پارلمـانی، زۆر جـار بـۆ خۆهێشـتنەوە یـان بـۆ دامـەزراندنی دەوڵەتـێکی تایـبەتی دەبێـت. لـەو حاڵەتـەدا کۆمـەڵو ڕێکخراوەکان، گەورەو بچووك یەکدەگرن تاکو بە هۆی ئەو یەکگرتنەیانەوە بەشێك لە دەسەڵات بگرنەدەست.

لەوانەیـە ئیئتـیلاف ڕواڵەتـێکی تێکدەرانەشی هەبێـت، واتـا بـە نـیازی ڕووخاندنی دەسەڵاتەوە یەك بگرن، هەروەکو چۆن لە وڵاتی فەرەنسـە ڕوویدا.. کە لە پاش دووەمین شەڕی جیهانی ڕێکخراوە سیاسییەکان یەکیان گرتو چەند جارێك دەوڵەتیان ڕووخاندو، ڕژێمو شیرازەی حوکمیان هەڵوەشاندەوە، ئەمەیان پێی دەڵێن **"ئیئتیلافی سەلبی"** یان بەرهەڵستکار.

لـە ئیئتـیلافی هەڵـبژاردندا دوو ڕێکخـراو یـان چەند ڕێکخراوێك بە قازانجی یەکتر دەنگ دەدەنو ناوچە هەڵبژاردنیەکان بە پێی توانا خۆیان بەسەر خۆیاندا دابەش دەکەن، هەر وەکو چۆن لە چوارەمین کۆماری فەرەنسەدا ڕوویدا.

**★ئاپارتهید-Apartheide**

بـە سیاسـەتی جـیاوازیخوازیو ڕەگەزپەرسـتی دەوڵـەتی ئەفـریقای خـواروو دەوترێت کە لە ساڵی (١٩٤٨)ەوە کاری پێدەکرێت. لە ئەفـریقای خوارو، لە نیوەی سەدەی حەڤدەیەمەوە کە ئەوروپاییەکان دەستیان کرد بە دەستێوەردانی وڵاتەکەیان بەردەوام جیاوازیی ڕەگەزایـەتی هـەیە، حـزبی مـیللی– حـزبی گـەل کە لە ساڵی (١٩٤٨)دا دەسەڵاتی سیاسیی وڵاتی گرتە دەست، چەند بڕیارێکی بۆ ئەو ڕەگەزانـە دەرکـرد کـە سـپی پێسـت نـینو هەموو لایەنەکانی ژیانیانی تیا گرتەوە. (لە ئەفریقای خواروو لە ٨٠٪ی دانیشتووانیان سپی پێسـت نـین).. ئـەو بـڕیارە بـۆ زیاتر خۆسەپاندنی سپی پێستەکانە. بڕیارەکانی حزبی میللی، سنووری بۆمافی سیاسی، هاتوچۆکردن، دیاریکردنی شـوێنی نیشـتەجێ، موڵکداریـتی، دیاریکـردنی ئـیشوکار، ژنهێـنانو.. بـۆ ئەو کەسانە دیاریکردووە کە سپی پێست نین.. مـافی سپی پێستەکانی بە زیانی ئەو ڕەگەزانەی سپیی پێست نین فراوان کردووە. لە ساڵی (١٩٥٣)دا بەشداریکردنی ڕەش پێستەکانو ئەو ڕەگەزانەی تر کە سپی پێست نین لە مانگرتنو ڕێپێواندا یان ژنو ژن خوازییاندا لەگەڵ سپی پێستەکاندا بە تاوان دانراوە.

پـەروەردەو فـێرکردنی ئـەو ڕەگەزانـەی کـە سـپی پێسـت نـەبوون درابـووە دەست "وەزارەتی کاروباری خەڵکە خۆرسکەکان" ئەو وەزارەتـەش هـەر مامۆسـتایەك پـەیڕەویی سیاسـەتی ڕەگەز پەرستیی نەکردبایە بە باشی دانەدەنا. کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٩٥٢)دا کەوتە لێکۆڵینەوەی ئەم مەسەلە (ئاپارتهید)، وە ئەمەی بە هەڕەشەکردن لە ئاشتیو مافی ئادەمیزاد دانا.

بەڵام دەوڵەتی ئەفریقای خواروو ڕێگای بەو لیژنەیە نەدا کە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەمکارە دانرابوون، بچنە وڵاتەکەیانەوە.

(حـزبی یەکگـرتوو)، کـە حزبـێکی بەرهەڵسـتکاری ئەفـریقای خوارووە، ناوەڕۆکی ئاپارتهید–Apartheide بە باش دەزانێت، بەڵام کردارەکانی بـەدڵ نییـە. ئەم سیاسەتی ڕەگەز پەرستییەی ئەفریقای خواروو دەوڵەتی لەبەرچاو جیهاندا ڕیسوا کردووە، بە تایبەتی لە ئاسـیاو ئەفریقادا. هەر ئەم سیاسەتە بوو کە ئەفریقای خوارووی وا لێکرد لە ناو یەکێتیی دەوڵەتە هاو قازانجەکانی بەریتانیادا کەنارگیر بکرێت.

**★ئۆپۆرتۆنیسم-Opportunisme**

هەلپەرسـت، بـە شوێن هەلدا گەڕان لە پێناوی قازانجی تایبەتیدا، لە سیاسەتدا "ئۆپۆرتۆنیست" بەو کەسانە دەوترێت کە هەمیشە خۆیان لە خاوەن دەسەڵات نزیك دەخەنەوەو پابەندی هیچ جۆرە هەڵوێستێك نینو هەموو هەڵوێستێکی خۆیان دۆڕاندووە.

**★ئاپۆلیتیسم-Apolitisme**

خـۆ نەبەسـتنەوە بـە سیاسـەتەوە، خـۆ پاراسـتن لە جموجووڵو کاروباری سیاسییانە، ئەو کەسانەن کە ڕێبازێکی ئاشکراو دیاریی سیاسـییان نییە، ئـەم زاراوەیـە لـە وشـەی (پۆلیتـیك)ەوە هـاتووە کـە بـە مانـا سیاسەت دەگرێتەوەو دانانی پیتی "ئا" لە سەرەتای

وشەکەوە بە مەفهوومی ڕەتکردنەوەیە.. بە واتایەکی تر بێ موبالاتیو خۆ تێ نەگەیاندن لە کاروبارو ژیانی سیاسیو دوورە پەرێز وەستان لە سیاسەت دەگرێتەوە. ئەم جۆرە ڕێبازانە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا، ڕژێمی سەرمایەداری بایەخی پێ دەدات.. خۆ تێ نەگەیاندن لە کاروباری سیاسیو گوێ نەدان بە ژیانی کۆمەلایەتیو سیاسی ئەنجامی ئەوەیە کە دەسەلاتدارانی ڕژێمی سەرمایەداری هەمیشە هەوڵ دەدەن کۆمەلانی خەلك لە سیاسەت دوور بخەنەوەو لە ناو ئایدۆلۆجییەکی دواکەوتووانەدا بیانهێڵنەوە. خەڵکی لە پێداویستییەکانی کۆمەڵ دوور بخەنەوەو بیانخەنە سەر ڕێگەی خۆپەرستیو داکۆکیکردن بە تەنیا لەسەر قازانجی خۆیان.

خۆ نەبەستنەوەو دوورەپەرێز وەستان لە سیاسەت تای مەسەلە نیشتمانیو چینایەتیو کۆمەلایەتییەکان بە باری قازانجی کۆنەپەرستاندا دەشکێنێتەوە، چونکە ئەندامانی کۆمەڵ لە خەباتی سەرجەمی خەلك دابڕ دەکاتو خەلك لە بەشداریکردنی داخوازیی نیشتمانیو چینایەتی دوور دەخاتەوە.

لە واقعدا زۆر ستەمە یەکێك بیەوێت لە کۆمەڵگەدا بژیو لە سیاسەت دوورە پەرێز بێت، دوورە پەرێز وەستان لە سیاسەت خۆی لە خۆیدا خزمەت بە دەسەلاتی دژی خەڵکی دەکاتو ئەم هەڵوێستە دەبێتە سیاسەتێکی زیان مەندانەو کۆنەپەرستانەو دژی خەڵك.

### ★ئۆتۆکراسی-Autocracy

بەو دەسەلاتدارییە دەوترێت کە ئەم خاسییەتانەی تیادا بێت:

*أ)فەرمانکردنی یەکێك بەسەر کۆمەڵێك کاربەدەستی ئیداریدا.*

*ب)یاسایەك یان نەریتێك نەبێت کە چاودێریی کاروباری فەرمانڕەواکان بکات.*

*ج)دەسەلاتی فەرمانڕەوا لە هەر کاروبارێکدا کە بیەوێت بیکات بێ سنوور بێت.*

تاکە کەسێکی خاوەن دەسەلات "ئۆتۆکرات" ڕەنگ بێ دەسەلاتی خۆی لە ڕێگای بڕیاردانو یاسای کۆمەلایەتییەوە گرتبێتە دەست، وە یان بە زۆر بەدەستی هێنابێت، کە لە شێوەی یەکەمدا ئۆتۆکراسی ڕەوایەو لە شێوەی دووەمدا دیکتاتۆرییە.. دەسەلاتدارە سەلتەنەتییەکان جۆرە حکومەتێکی ئۆتۆکراتین.

### ★ئیرتیجاع-Reaction

لە مەفهومی سیاسیدا ئەم زاراوەیە بە مانا پێچەوانەی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی دەگرێتەوە، بەربەرەکانێی کرداری پێشکەوتووانەی چینو توێژەکانی کۆمەڵە.

ڕێڕەوی حەتمیگیریی مێژوو ڕاپەڕینی کۆمەلانی خەلك، کۆمەلگای ئادەمیزاد بەرەو پێشکەوتنو گەشەکردن دەبات.. ئەو چینو توێژانەی لە کۆمەڵدا حوکم فەرمان لەگەڵ ئەو ڕێبازە پێشکەوتووانانەدا ناگونجێنو دەیانەوێت دۆخی کۆن وەکو خۆی بهێڵنەوە، چونکە گۆڕانو پێشکەوتنی کۆمەڵ ئەوان بەرەو نەمان دەبات، وەکو: لەناوچوونی کۆمەڵگەی کۆیلەیەتی، دوای ئەوان خاوەن موڵکەکان "فیوداڵ" ئینجا سەرمایەدارەکان.. ئەم چینو توێژانە لە پێناوی مانەوەی خۆیانو پاراستنی قازانجی خۆیانا هەمیشە بەربەرەکانێی پێشکەوتنی کۆمەڵو گەشەکردنی چینەکانی کۆمەڵ دەکەن.

کەوابوو "ئیرتیجاع" بە مانا داکۆکیکردنە لەسەر ڕژێمی گەندەڵ، واتا بەربەرەکانێی پێشکەوتنە.

لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا، لەو وڵاتانەی کە لە بواری سنعەتدا پێشکەوتوون، فاشیزمو میلیتاریزم لە ڕیزی پێشەوەی کۆنەپەرستان واتە "ئیرتیجاع" دەوەستن.

ئیرتیجاع–کۆنەپەرست، بەو کەسانە دەڵێن کە بەربەرەکانێی هەموو هەنگاوێکی پێشکەوتووانە دەکاتو بەرەنگاری هەموو کردارێکی تازە دەوەستێ.. هەوڵ دەدات ڕژێمی کۆنەو گەندەڵ بە حوکمی بیری کۆنەپەرستانەی خۆی بپارێزێت.

### ★ئاریستۆکراتی - Aristocratie

ئەم زاراوەیە بە مانا دەستەی پیاوماقوولان دەگرێتەوە، بەو توێژو کۆمەلانە دەڵێن کە دەسەلاتێکی زۆریان هەیە، سامانو توانای دەسەلاتیان زۆرە، پایەو پلەی کۆمەلایەتییان لەناو خەڵکدا بەرزە، ئەمانە هەوڵی ئەوە دەدەن ئەو پلەو پایەیەی هەیانە بیپارێزنو بە میرات لە یەکتر وەریبگرن. ئەسڵی ئەم زاراوەیە بەو کۆمەڵە خەڵکانەیان دەوت کە لە کۆتایی کۆمەڵگەی کۆمۆنی سەرەتاییدا خاوەن سامانو دەسەلات بوون، یان بە سەرکردەی خێڵو فەرماندەکانیان دەوت، کە دەسەلاتدار بوون. کەوابوو ئاریستۆکراسی لە سەردەمی سیستمی "باوك سالاری"[1] دا پەیدابووە.. لە کۆمەڵگەی کۆیلەییدا بە دەوڵەمەندترین بنەماڵەیان دەوت کە کۆیلەو زەویوزارێکی زۆری هەیە، لە کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتیشدا "فیوداڵی" بە خاوەن زەویوزاری زۆرو بە دەسەلاتیان دەوت، کە لە دەزگاکانی دەوڵەتدا شوێنو پایەی بەرزیان بووبێت. کە ئەمانەش هەمووی بە میرات لە یەکترەوە وەردەگیران.

یەکەمین شۆڕشی بۆرجوازی لە دژی ئاریستۆکراسییەکان کرا، کە لە زۆر شوێنو دەوڵەتدا دەسەلاتی سیاسییان لە دەست وەرگیرا، لە زۆر وڵاتانی تریشدا دوو چینی چەوسێنەرەوە، بۆرجوازیو فیوداڵە ئاریستۆکراتەکان ڕێکەوتن کە پێکەوە بەشداریی دەوڵەت بکەن.

---

١–ئەو سیستمە کۆمەلایەتییە کە ئەرکی بەڕێوەبردنی خێزان لە ئەستۆی باوکاندایە کە بە (پدر سالار)ی پێدەوترێت – وەرگێر.

لە ئەنجامی گەشەکردنی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا گەلێك لە ئاریستۆکراتەکان خۆیان تێکەڵ بە هەلومەرجی تازە کردو هەموویان بوونە سەرمایەداری گەورە.

بە مانای گشتی ئاریستۆکرات توێژە دەسەلاتدارەکانی سەرەوەی کۆمەڵن. "ئاریستۆکراتی کرێکاران"یش، زاراوەیەکە بەو کۆمەڵە کرێکارە دەڵێن کە لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا دەستیان بەسەر قازانجی زۆردا گرتووەو خۆیان لە کۆمەڵانی تری کرێکاران جیاکردووەتەوە. ئەوانە نوێنەری دەسەلاتو ئایدۆلۆجیو قازانجو سیاسەتی سەرمایەدارانن لەناو پرۆلیتاریادا.

### ★ئیستیبداد-ئەپسولوتیسم - Apsolutisme

بونیاتنانی سیاسییە کە ئەم تایبەتییانەی تیادا بێت:

*أ)دەسەلاتی دەوڵەت هیچ سنوورێکی یاسایی یان نەریتیی بۆ دانەنرێت..*

*ب)فراوانبوونی شیرازەی حوکمو بەستنەوەیان بە دەزگای ئیداریی ناوەندەوە.*

**ئیستیبداد، ئۆتۆکراسی، دسپۆتیزم..**

ئەمانە لە مەفهومدا یەك دەگرنەوە، بەڵام لە سروشتدا وەکو یەك نین، هەر وەکو چۆن تۆتالیتریزم جۆرێکە لە ئیستیبداد، بەڵام هەموو ئیستیبدادێك تۆتالیتر نییە.

لە جیهانی کۆندا چەندان دەوڵەتی خاوەن شارستانێتی کۆن هەبووە، وەکو: ئاشور، بابل، میسر، ئێرانو.. کە ئەمانە سەرجەم دەوڵەتی ئیستیبدادی بوون. تەنیا یۆنانو رۆم نەبێت کە تەنیا دیکتاتۆری کاتییان هەبووە.

لە سەدەی شازدەیەم بە دواوە ئیستیبداد لە ئەوروپا روخسارێکی تازەی بە خۆوە گرت. ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە دەوڵەتە گەلیەکانو پادشایان بەرامبەر بە دەسەلاتی "پاپ" ڕاست بوونەوەو ئیستیبداد وەکو ڕێبازێکی سیاسی لێهاتو دەوڵەتە گە لییەکانی یەکخستو بە شێوەیەکی تازە رێکی خستن.

بۆ نموونە لویسی چواردەیەم کە وتی:

*"من دەوڵەتم" ئەوە نموونەی ئیستیبدادیی سەدەکانی حەڤدەو هەژدەیەم بوو، چونکە دەسەلاتێکی بێ سنووری هەبوو.. لە سەدەی هەژدەیەمدا شۆرشەکانی ئەمریکاو فەرەنسە بە ئیستیبدادەوە ڕاپەڕین. ئەم ڕاپەڕینە لە ماوەی سەدەکانی نۆزدەیەمو بیستەمدا بوو بە هۆی هاتنەکایەی چەندان دەوڵەتی یاسایی لە سەرتاسەری جیهاندا، وە لە هەمان کاتدا لە سەدەی بیستەمدا جۆرە ئیستیبدادێکی تازە پەیدا بوو کە پێی دەوترێت "توتالیتریزم".*

### ★ئیستیثمار - Exploitation

زاراوەی ئیستیثمار لە وشەی (سەمەر)ەوە هاتووە، بە فارسی بەهرەکەشی واتا سوود لێوەرگرتنە.. لە بواری ئابووریو کۆمەلایەتیدا مانای سوود وەرگرتن لە کاری کەسێکی تر دەگرێتەوە. مانای زانستییانەی ئیستیثمار بەم جۆرەیە:

بەدەستهێنانی بەرهەمی کاری بەخۆرایی کەسێك لە لایەن یەکێکی تری خاوەن هۆیەکانی بەرهەمهێنانەوە، لە بواری ئابووریشدا بەدەستهێنانی بەرهەمی کارکردنی زیادەو هەندێك کاتی ئیشکردنی دیاریکراو، لە کاتی بەکارهێنانی ئەم زاراوەیەدا دەڵێن دەسکەوتی کەسێك لە بەرهەمی ڕەنجی کەسێکی تر.

ئیستیثمار، وشەیەکی گشتیی هەموو کۆمەڵگا چینایەتییەکانە، دیسانەوە ئەو چینە خاوەن هۆیانەی بەرهەمهێنانن کە ئەندامانی چینەکانی تر دەچەوسێننەوەو بەرهەمەکانیان دەبەن، کەوابوو هۆی ئیستیثمار بریتییە لە موڵکداریتیی تایبەتیو خاوەندارێتیی هۆیەکانی بەرهەمهێنان، بەڵام شێوەکانی ئیستیثمار پابەندە بە خاسییەتی ئەو ڕژێمانەوە کە خاوەنی بەرهەمهێنانن لە کۆمەڵگەدا.

بەهرە وەرگرتنی کەسێك لە کەسێکی تر پێویستیی بوونی ئادەمیزاد نییە، وە لە سەرەتای پەیدابوونی کۆمەڵگای ئادەمیزاددا ئەمکارە نەبووە، دیسان بەردەوامیش نامێنێتەوە. ئیستیثمار لە یەکەمین ڕۆژگاری کۆمەلایەتی ئابووری (واتا کۆمۆنی سەرەتایی)دا نەبووە، بەڵکو لە قۆناغی لەناو چوونی ئەو سەردەمەدا پەیدا بووە.

### ★ئیستیعمار - Colonisation

ئیستیعمار بە سیاسەتی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان دەڵێن، کە ئامانجی چەوساندنەوەو سوود وەرگرتن بێت لە خەڵکی وڵاتانی تر، خەڵکی ئەو وڵاتانەی کە لە بواری ئابووریدا هێشتا گەشەیان نەکردووەو بە دواکەوتوویی ماونەتەوە، دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان بۆ مەحکەمکردنی شیرازەی حوکمو دەسەلاتی خۆیان ڕێگە لە گەشەکردنی ئابووریو هونەریو فەرهەنگیی ئەو وڵاتانە دەگرن، لە سەدەکانی ڕابوردوودا، واتا بەر لە پەیدابوونی ئیمپریالیزم ئیستیعمار چەندان ناوچەو وڵاتی لە ژێر دەستدا بووە، بەڵام ئێمە تەنیا باسی سەدەی بیستەمیان دەکەین کە خۆی لە خۆیدا ڕوخساری دابەشکردنی وڵاتانی جیهانو دامەزراندنی ئیمپراتۆریو دیاریکردنی ناوچە ژێردەستەکان، دەگرێتەوە ئەمانە ڕوکارو ڕوخساری تایبەتیی سەردەمی ئیمپریالیزمن.

**موستەعمەرە:**

بەو وڵاتانە دەڵێن کە سەربەخۆیی سیاسیو ئابووریی نەبێتو لە هەموو کارو بارێکدا سەر بە دەوڵەتێکی ئیمپریالیستیی داگیرکار بێت. دەزگا ئینحیسارییە ئیمپریالیستییەکان سوود لە کەرەستەی خاوو ئیشکردنی کرێکاران بە هەرزان وەردەگرن تیایداو دەست

بەسەر بازاڕەکانیشیاندا دەگرن و کەلوپەلی خۆیانی تیادا دەفرۆشن و سەرمایەی خۆیانی تیادا دەخەنە کارەوە. هەروەها زۆر جاریش دەیانکەنە بنکەو ئۆردوگای سەربازیی خۆیان.

سیستمی موستەعمەرەی ئیمپریالیستی: لە ناو ئەو ناوچە ژێردەستانەدا "موستەعمەرە" وڵاتانی نیمچە ژێردەستەو گرێدراو هەیە کە لە کاروباری هەمە جۆرەی سیاسی یان ئابووریدا هەر یەکە بە پێی گرێدراویی خۆی بە دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکانەوە پابەندی دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکانن.. (سیستمی موستەعمەرەی ئیمپریالیستی) هەموو ئەو وڵاتە ژێردەستانە (موستەعمەرە)و نیمچە ژێردەستەو ناوچە گرێدراوانە دەگرێتەوە کە دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکان دەستیان بەسەردا گرتوون و سوودیان لێ وەردەگرن.

ئەم سیستەمە لە قۆناغی دەست بەسەردا گرتنی سەرمایەداریدا پەیدابووە، لە سەرەتای سەدەی ئێستادا چەند وڵاتێکی گەورەی ئیمپریالیستی بە هۆی هێزی لەشکرو لژێونەکانی دەرەوە، وڵاتە ژێردەستە کراوەکانی جیهانیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکردبوو، دوای ئەوەش چەند جارێك بۆ سەر لەنوێ دابەشکردنەوەی وڵاتە ژێردەستە کراوەکان لە نێوان خۆیانا لێیان بووەتە مشتو مڕو زۆر جاریش شەڕ لە نێوان هەندێکیاندا هەڵگیرساوە، لەم بارەیەوە وتراوە:

*"سەرمایەداری بە هۆی هەندێك وڵاتانی بە ناو پێشکەوتووەوە بووە بە سیستمێکی جیهانیی ستەمو زۆرداریی و دەست بەسەرداگرتنی دارایی زۆربەی خەڵکی جیهان".*

### ★ئابوریی سیاسی - Economiepolitigue

ئابووریی سیاسی، بریتییە لە زانستی یاساکانی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی بەروبوومی ماددی لە قۆناغە جۆربەجۆرەکانی گەشەکردنی کۆمەڵگەی ئادەمیزاددا.

لە ڕۆژگاری کۆیلەییدا کە ئابووریی سیاسی وەکو زانستێکی عەمەلی خۆی نواند، ماهییەتی چینایەتی دەرکەوت و بەو جۆرە کە چینە دەسەڵاتدارەکان کردیان بە ئایدۆلۆجیی خاوەن کۆیلەکان بۆ سوودوەرگرتن لە بەرهەمی کۆیلەکان، بەرەبەرە لەگەڵ گەشەکردنی کۆمەڵ و باری کۆمەڵایەتی و ئابووریدا ئەهمییەتی زانستی ئابووری بەرەو پێشتر چوو.

ئابووریی سیاسیی کلاسیك، بۆرجوازی، لەگەڵ گەشەکردنی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا پەیدا دەبێت کە ئابووریی زانەکانی وەکو (ئادام سمیپ)[1] و (دیڤید ریکاردۆ) چەندان هەنگاوی گرنگیان لە ڕێگەی زانینی یاساکانی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی کۆمەڵایەتییانەی بەروبوومی مادییەوە نا.. ئەم بیرو باوەڕە بنچینەکانی زانستی ئابووریی سەرمایەداریی داڕشت، ئەم بیروباوەڕە ڕژێمی سەرمایەداریی بە شتێکی جاویدانی دادەنا، وە هەر قازانجی بۆرجوازییەکان بوو کە لە سەرەتای ڕۆژگاری گەشەکردنیدا بەربەرەکانێی فیۆدالیزمی دەکردو بەسەریدا سەردەکەوت، ئەم بیروباوەڕە لە کۆتایی سەدەی حەڤدەیەم و سەرەتای سەدەی هەژدەیەمی زایینیدا لە بەریتانیاو فەڕەنسە دەورێکی باڵای هەبوو.

#### ئابووریی سیاسیی شۆڕشگێڕانە:

لەگەڵ پەیدابوونی چینی پرۆلیتاریا، ئابووریی سیاسیی شۆڕشگێڕانە وەکو هێزێکی چینایەتیی سەربەخۆ سەریهەڵدا، ڕابەرەکانی ڕاپەڕینی کرێکاران لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەیەمدا شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییان لە هەموو لایەنێکەوە خستە بەر لێدووان و لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی زانستییانە، بە هۆی سوود وەرگرتن لە عونسورەکانی زانستی ئابووریی سیاسیی کلاسیکی بۆرجوازی، ئابووریی سیاسیی پرۆلیتارییان وەکو زانستێکی تەواو دەرهێنا، کە ئێستاکەش بە بەشێکی گرنگی تیۆری هەمەلایەنیانەی شۆڕشگێڕانە دادەنرێت، ئابووریی سیاسیی شۆڕشگێڕانە لە مێژووی ئابووریی سیاسیدا پەیدابووە. ئەم ڕێبازە زانستییە هەموو مەسەلە بنچینەییەکانی ئابووریی ڕوونکردووەتەوەو بەردەوام ڕوونتریش دەبێتەوە.

ئەم ڕێبازە پەیوەندییەکانی نێوان خەڵك و چینەکانی کۆمەڵ و پەیوەندییەکانی ئابووری و بەرهەمهێنانی ڕوونکردووەتەوە، پەیوەندییە بەرهەمهێنەرەکان بە گەورەترین هۆی بنچینەیی دادەنێ لە ناو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا.

### ★ئالیگارشی - Oligarchie

زاراوەی ئالیگارشی لە زۆربەی زمانە ئەوروپاییەکاندا بەکار دەهێنرێ و بە مانا دەسەڵاتداریی کۆمەڵێکی دیاریکراو دەگرێتەوە، مەفهومی ئەم زاراوەیە دەسەڵاتی سیاسی و ئابووریی چەند کۆمەڵێك لە خاوەن سامانە بە دەسەڵاتەکانە. شێوەیەکە لە شێوەکانی حکومەتیکردن لە ڕژێمە ئیستیثمارییەکاندا، ئەم جۆرە حکومەتانە لە سەردەمە جۆر بە جۆرە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی (کۆیلەداری و فیودالی و سەرمایەداری) دا هەبووە. ئەو کاتەبووە کە تاقمێك خاوەن سامان و بە دەسەڵات هەموو هۆیەکانی بەرهەمهێنانیان گرتبووە ژێردەستی خۆیان و حوکمیان بەسەر کۆمەڵانی خەڵکدا کردووە. ئەمەیە ماناو مەفهومی گشتیی ئالیگارشی.. ئەم وشەیە لە زمانی یۆنانی (ئولیگارکیا) وەرگیراوە، کە لە سەردەمی کۆنی یۆناندا بە مانای حکومەتی تاقمێکی کەمیان وتووە، تاقمێك لە توێژەکانی سەرخانی کۆمەڵ و دەوڵەمەندە دەسەڵاتدارەکان بووە.

---

1- A-Smith

**ئالیگارشیی مالی:**

ئـەم زاراوەیـەش زۆر جـار بەکاردەهێنرێت واتـە سـەربەخۆیی سیاسـیو ئـابووریی کۆمەڵـە سـەرمایەدارێکی گەورەی خاوەن پارە، چـەندان کۆمپانـیای ئینحیسـاریو سـنعەتیو بانقیان بـە دەسـتەوە بێت. چـاودێریی لقـە بنچـینەییەکانی ئـابووری بکـەن، بـەم واتایە ئالیگارشـیی مـالی لـە قۆناغی ئیمپریالیزمدا دەبێت، واتە لە قۆناغی باڵاترین پلەی گەشەکردنی سەرمایەداریدا، ئالیگارشیی مالی دیسان بـە دەسـەڵاتی ئـابووریو سیاسـیی سـەرمایەدارە گـەورەکان دەڵـێن لـە قۆنـاغی ئیمپریالـیزمدا، لـە کاتـێکدا کـە چـەند کۆمپانـیایەکی ئینحیسـاریی زۆر گـەورە دەسـت بەسـەر هەموو بەشە ئابوورییەکانی سەرمایەداریدا دەگرن. وە لە ئەنجامی تێکەڵکردنی سەرمایەداریی سنعەتو ئینحیساریو سەرمایەی بانقەکان "سەرمایەی مالی" پەیدا دەبێت.

**نموونەیەکی ئالیگارشیی مالی:**

*لـە وڵاتـە یەکگـرتووەکانی ئەمـریکادا کۆمەڵـێک دەوڵەمەندو خاوەن کارخانەو پارەو دەزگای ئینحیساری وەکو مۆرگانو دوپنو روکفلەر دەسەڵاتیان بەسەر هەموو ئابووریو سیاسەتی وڵاتدا گرتووە.*

لە ئەمریکادا ئەمانە بە (٦٠) شەست بنەماڵەی گەورە ناسراون، بەڵام لە واقع دا لە (٩) نۆ کۆمەڵ زیاتر نین.. ئەمانە هەموو شیرازە بنچینەییەکانی ئـابووریو سیاسـەتی نـاوخۆو دەرەوەو چـاپەمەنیو هۆیـەکانی ڕاگـەیاندنو دەزگـا دەوڵەتیـیەکانو دانشـگاو دەزگـاو دامەزراوە هونەریو تەکنیکییەکانیان بە دەستەوەیە.

بـنەماڵەی مۆرگـان (١٢) دەزگاو دامەزراوەی گەورەی وەکو: بانقەکان، دەزگای سنعەتی، گواستنەوەو بارکردن، دەزگای سەربازی، لەگـەڵ سـامانێکی زیاتـر لـە پـەنجا ملـیارد دۆلاریـیان بـە دەسـتەوەیە. هـەروەها بنەماڵەی روکفلەر (٩) نۆ دەزگای گەورەی سنعەتیی نـەوتیو بـانقو سەرمایەی چل ملیارد دۆلاریی هەیە، بنەماڵەی دوپن پیشەسازیی کیمیاییو کارخانەی ئۆتۆمۆبیلسازیی هەیە. بنەماڵەی فـۆرد سنعەتی ئۆتۆمۆبیلیان هەیە، لە فەرەنسە ئەم ئالیگارشییە نزیکەی (٢٠٠) دووسەد بنەماڵەی ناسراون کە سەرمایەی ئینحیساریی بانقو سنعەتی فەرەنسەیان بە دەستەوەیە.

روتشـیار، ونـدل، شـنایدر، داسـو، مالـە.. ئەمانـە بەناوبانگترین بنەماڵەی ئالیگارشیی مالیی فەرەنسەن.. ئالیگارشیی مالی جگە لە دەسـت بەسـەرداگرتنی ئـابووریی وڵات سـوود لـە سـنعەتی کەرەسـەی جەنگیی وەردەگرێو دەست بەسەر دەزگا دەوڵەتییەکانی وەکو ڕاگـەیاندنو فـێرکردندا دەگرێـت، تەنانـەت پـەل بـۆ سیاسـەتی نـاوخۆو دەرەوەی وڵاتانـیش دەکوتـێ.. لـە کـاتی دەسـەڵاتدارێتیی ئالیگارشـیی مالـیدا ئازادیـیە دیموکراتیـیەکانی بۆرجوازیش دەچەوسێنەوە. دەسـەڵاتی دەوڵـەت دەکەوێـتە دەسـت توێژێکـی زۆر بـە دەسەڵاتەوە کە پێی دەڵێن پلۆتۆکراسی[1].

**★ئیمپریالیزم - Imperialisme**

باڵاتـرینو دوا قۆنـاغی سـەرمایەدارییە، ئـەم قۆنـاغـە لـە کۆتـایی سـەدەی نۆزدەیـەمو سـەرەتای سـەدەی ئێسـتادا "بیسـتەم" پـەیدابووە.. زانایـان لـە تـیۆری ئیمپریالیزمـیان کۆڵـیوەتەوەو ڕوخسـاری تایبەتـیی ئیمپریالیزمـیان داوەتـە بـەر سەرنجو لەم خاڵانەی خوارەوەدا شییان کردووەتەوە:

*١-کۆکـردنەوەو زۆربوونـی بەرهـەمو سـەرمایە بـوو بـەهۆی پـەیدابوونی دەزگـا ئینحیسـارییەکان "مۆنۆپۆلـەکان". دەزگـا ئینحیسارییەکان لە قۆناغی خۆیاندا ڕۆڵێکی گەورە لە ژیانی ئابووریدا دەگێڕن.*

*٢-لێدانو تێکەڵکردنی سەرمایەی بانقەکانو سەرمایە سنعەتییەکان بوو بە هۆی پەیدابوونی سەرمایەی مالیو ئالیگارشیی مالی.*

*٣-خستنەکاری سەرمایە لە جێگەی خستنەکاری کەلوپەل، ئەهمیەتێکی تایبەتیی بۆ خۆی پەیداکرد.*

*٤-پـەیدابوونی یەکێتیـیەکانو کۆنسـێرنە ئینحیسـارییە سـەرمایەدارییەکان، ئـەم یەکێتیـیانە وەکـو کارتلـەکان، تراسـتەکان، کۆنسرسیومەکان.. جیهان لەڕووی ئابوورییەوە لە نێوان خۆیاندا دابەشدەکەن.*

*٥-کۆتـایی دابەشـکردنی ناوچـەو سـەرزەمینەکانی جیـهان لـە نـێوان گەورەتـرینو دەوڵەمەندتـرین دەوڵەتـە سەرمایەدارییە کانداو سەرەتای دابەشکردنەوەی سەر لەنوێی ناوچەکانی جیهان لەنێوانیاندا.*

بنچینەی ئـابووریی خاسییەتی تایبەتی ئیمپریالیزم بریتییە لە دەسەڵاتدارێتیی دەزگا ئینحیسارییەکان.. دەزگا ئینحیسارییەکان هـەموو شـیرازەو لایەنە ئابووریو سیاسییەکانی گەورەترین وڵاتانی سەرمایەداری دەگرنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانو بەربەرەکانێی ئازادانە لـە نـاو دەبـەن، دەسـەڵاتی دەزگا ئینحیسارییەکان لە ژیانی ئابووریدا لەگەڵ تواناو دەسەڵاتی ڕۆژانەیان لە زەمینەی سیاسیدا هاوتان، چونکە دەزگاکانی دەوڵەت دەکێشنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

لـەم قۆناغـەی سـەرمایەداریدا، دەزگـا ئینحیسـارییەکان وەکـو ئیمـپراتۆرە بە دەسەڵاتەکان دەبن لە هەموو کاروبارێکدا، دیسانەوە زاراوەی ئیمپریالیزم لە وشەی ئیمپریۆ[2]ی لاتینی وەرگیراوە کە بە مانا ئیمپراتۆر دەگرێتەوە.

بەکورتی ئیمپریالیزم دوا قۆناغی ژیانی سەرمایەدارییە، ئیمپریالیزم هێلانەی شۆڕشی سۆشیالیستانەیە، لەم قۆناغەدا، لەناو هەموو سیسـتمە جیهانییەکانی سەرمایەداریدا هەلومەرجی لەبار بۆ شۆڕشی کۆمەڵایەتیی پرۆلیتار دەرەخسێ.. ناکۆکیی نێوان کارو سەرمایە، ناکۆکیی نـێوان دەوڵەتـە ئیمپریالیستییەکانو وڵاتـە ژێردەسـتەکانیانو ئـەو وڵاتانـەی پێیانەوە گرێدراون، ناکۆکیی نـێوان دەوڵەتە

---

١-Plutocratie

٢-Imperiu

ئیمپریالیستییەکان لەناو خۆیاندا تادێت توندوتیژ تر دەبێت.. پەیدابوونی ئەم ناکۆکییە سێ قۆڵییە دەبێتە هۆی پەیدابوونی سیستمی جیهانی سوشیالیستی.

**⋆ئیمتیاز - Concession**

ئیمتیاز لە ڕژێمی سەرمایەداریدا بریتییە لەوەی کە سەرمایەدارەکان، یان دەزگا ئینحیسارییەکان مافی ئەوەیان هەبێت بەپێی هەلومەرجی تایبەتی سوود لە هەندێك دەزگاو دامەزراوەکان، زەوییەکان، سامانی سروشتی، کانەکان، دەریاکانو هەموو کاروبارە ئابوورییەکانی تر وەربگرن. ئەم سامانانە ئەم دەزگاو دامەزراوو کاروبارە ئابوورییانە هینی دەوڵەت یان پارێزگا یان شارەوانییەکانن، کە بە هۆی ئیمتیازەوە سەرمایەدارانی ناوخۆو دەرەوە سوودیان لێ وەردەگرنو دەیانگرنە ژێر دەستی خۆیانەوە.. سەرمایەدارانو دەزگا ئینحیسارییە سەرمایەدارییەکان بۆ بە دەستهێنانی کەرەستەی خاوو دەستگرتن بەسەر ئابووریی وڵاتدا، بۆ بەرهەمهێنانی بێ بەزەییانەو چەوساندنەوەی کرێکارانی ناوخۆو دەست گرتنی بەسەر سیاسەتی وڵاتدا سوود لە ئیمتیاز وەر دەگرن، لە قۆناغی ئیمپریالیزمدا، وەرگرتنی ئیمتیاز لەو وڵاتانەی کە بە ئیمپریالیزمەوە گرێدراون بایەخێکی زۆری هەیە.

**⋆ئانارشیزم - Anarshisme**

ڕێبازێکی سیاسیی ئاژاوەچییانەیە کە لەگەڵ ئاواتو قازانجی چینی کرێکارو هەموو زەحمەتکێشاندا ناگونجێت. لە ڕووی چینایەتییەوە تابعێکی وردە بۆرجوازییانەی هەیە، لە باری سەرنجی سیاسیشەوە کۆنەپەرستانەیە، چونکە لە پێناوی گەشەکردنی کۆمەڵدا نییە.

ئەم زاراوەیە لە وشەی (ئانارخیا)ی یۆنانییەوە وەرگیراوە کە بە مانا نەبوونی ڕابەرو حکومەت دەگرێتەوە، ئانارشییەکان دەوڵەتی پرۆلیتارییان لە هەر هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتیدا ناوێتو حزبو ڕێکخستنو ڕێبازی سیاسییانەو بەرنامەی کاری هەر حزبو ڕێکخراوێك بە پێویست نازانن.

لە ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەدا ئەوانەی لایەنگریی ئانارشیزم دەکەن بەربەرەکانێی ڕابەری ڕاپەڕینەکەو ئایدۆلۆجیی کۆمەڵە ڕاپەڕیوەکە دەکەن. ئەوانە بە بیانووی ئەوەی کە ئینسان ئازادە تەنیا کاری تاکە کەسییان بە لاوە پەسەندە، کاری جەماوەرانەو خەباتی چینایەتییانەو ڕاپەڕینی کۆمەڵایەتییانە بە هیچ دادەنێن..

ئانارشیزم، هەمیشە بەرپەرچی ڕاپەڕینی خەڵكو یەکێتیی نێوان کۆمەڵانی خەڵك دەداتەوە، هەوڵ دەدات چینی کرێکار لەسەر پەیامی مێژوویی خۆی بگێڕێتەوە دواوە، لە جیاتیی ڕێکخستنو یەکگرتن، دووبەرەکایەتیو ئاژاوە دەنێتەوە. ئانارشیزم وەکو ڕێبازێکی سیاسییانە ماوەی (١٠٠ تا ١٣٠ ) ساڵ لەمەوبەر[١] لە ئەوروپا پەیدابوو، کەسانی وەکو ماکس ئاشتیرنر[٢] و پرودونو باکونین[٣] ڕابەرییان دەکرد.

دانەرانی تیۆری سۆشیالیستی زانستی بۆ دروستکردنو دامەزراندنی ڕێکخراوی سیاسیی کرێکاران گەلێك لەگەڵ نوێنەرانی ئەم ڕێبازەدا کەوتنە مشتومڕەوەو گەلێك بەربەرەکانێیان کردن.. لەم ڕووەوە وتوویانە:

*"ئانارشیستەکان، چینی کرێکار بۆ سەرمایەدارەکان دەستەمۆ دەکەن، جگە لە چەند وشەیەك لە بارەی بەرهەم وەرگرتنەوە هیچی تریان فێرناکەن، ئەویش بێ ئەوەی لە ڕیشەو هۆیەکانی بگەن، باوەڕیان بە خەباتی چینایەتیانە نییە".*

**⋆ئاندیڤدۆئالیزم - Indivdualisme**

ئەم زاراوەیە، لە وشەی ئیندیڤیدۆ[١] وەرگیراوە کە لە زۆربەی زمانە ئەوروپاییەکاندا بە مانای تاك یان تاکە کەس هاتووە، بەو شێوەیە ڕێبازی ئاندیڤیدۆئالیزم بە ڕێبازی تاکە کەسی ناو دەبرێت کە ئەمەش لە خاسیەتەکانی ئایدۆلۆجی گیانی وردە بۆرجوازییە، وە لە هەموو ئەو ڕوحییەتانەی کە لە کۆمەڵدا موڵکدارێتیی تایبەتی پەسەند دەکەن خۆی دەنوێنێت..

بە کورتی مانای بایەخدان بە تاکە کەس دەگرێتەوە تاکو کۆمەڵ. دیسان مانای ڕەسەنییەتو ئەهمییەتی تاکە کەسە بەسەر زۆربەی کۆمەڵدا.. دروشمی ئاندیڤیدۆئالیزم بەم جۆرەیە:

**یەکەم تاکە کەس ئینجا کۆمەڵ..**

هەموو فەلسەفە هاوچەرخەکانی سەرمایەداری کە لە هەموو مەسەلە بنچینەییو فەلسەفیو کۆمەڵ شوناسییەکان کۆڵاونەتەوە، هەموویان لەسەر بنچینەی فەلسەفەی بە ڕەسەنییەت ناسینی تاکە کەس دامەزراون.

بە پێچەوانەی ئەمەشەوە "ڕەسەنییەتی کۆمەڵ" یان "ڕێبازی دەستەجەمعی" تیۆریو عەمەلییە کە بە پێی ئەو ڕێبازە ڕێزی قازانجی گشتی دەدات بەسەر قازانجی تاکە کەسدا ڕێبازی ڕەسەنییەتی کۆمەڵی سوشیالیستی لەسەر موڵکدارێتیی هەرەوەزیو هۆیەکانی بەرهەمهێنان دامەزراوە.. بە بێ ڕێبازێکی موڵکدارێتیی هەرەوەزیو کۆمەڵگەیەکی سۆشیالیستی هیچ هەلومەرجێکی واقعیی

---

١–واتە لە کاتی سەردەمی نووسینی ئەم کتێبەوە.

٢–M-Stirner

٣–Bakunin

١–Indivdu

بۆ پەروەردەکردنی هەموو لایەنەکانی کۆمەڵ لەگەڵ گیانی هەرەوەزیدا نایەتە دیو پەیوەندیی هاریکاری ناتوانێت جێگەی پەیوەندییەکانی ستەم بگرێتەوە.

**★ئەنتەرناسیونال - Internationale**

زاراوەی "ئەنتەرناسیونال" بە مانا "نێونەتەوەیی" یە، بەو ڕێکخراوە کرێکارییە جیهانییە وترا کە لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا تا ناوەڕاستی سەدەی ئێستا لە قۆناغە جۆر بەجۆرەکانی گەشەکردنی کۆمەڵدا دامەزرا.

بنچینەی یەکەمین کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی کرێکاران کە لە دواییدا بە ئەنتەرناسیۆنالی یەکەم ناوبرا لە ساڵی ١٨٦٤دا لەلایەن مامۆستایانی پرۆلیتاریاوە دانرا. ماوەیەکی زۆر بوو هەوڵی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕانەی چینی کرێکاران دەدرا، ئەنتەرناسیونال وەکو ڕێکخراوێکی نێونەتەوەیی پرۆلیتاریاو نموونەی سەرکەوتنی ئامۆژگارییەکان لەناو ڕاپەڕینی چینی کرێکاراندا لە سەدەی ڕابردوودا سەری هەڵدا. لە ئەنجامی گەشەکردنی سەرمایەداری لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمداو ڕاپەڕینی چینی کرێکارانو هاتنە پێشەوەی سیستمی دیموکراتیك لە زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکانا پێویستیی هاریکاریو یەکگرتنی چینی پرۆلیتاریا، ڕێکخراوی نێونەتەوەیی کرێکاران وەکو پێویستییەکی مێژوویی هاتە کایەوە.

ئەنتەرناسیونالی یەکەم لە (٢٨/مانگی ئەیلولی ساڵی ١٨٦٤) لە لەندەن دامەزرا. بەیاننامەی ئەو دامەزراندنە بوو بە بەرنامەی پرۆلیتاریای شۆڕشگێڕ لە سەدەی نۆزدەیەمدا. لەو بەیاننامەیەدا ئەرکی لە ناوبردنی دەسەڵاتی سەرمایەداریو جێگیربوونی حکومەتی کرێکاران لە ڕێگای ڕاپەڕینی سیاسییەوە کەوتە ئەستۆی کرێکاران.

ڕێکخراوە کرێکارییەکانی ئەو ڕۆژگارە وەکو لقی ئەم ڕێکخراوە نێو نەتەوەییە لە وڵاتەکانی ترا پێکهاتن. لە ماوەی کەمتر لە دوو ساڵ نزیکەی ٢٥ بیستو پێنج ڕێکخراوی کرێکاری لە زۆربەی وڵاتەکانی ئەوروپاو کیشوەرەکانی ترا دامەزران. کتێبی سەرمایە "کاپیتاڵ" لە ساڵی ١٨٦٧دا لە بارەی ڕێکخراوە کرێکارییەکانەوەو گیانی شۆڕشگێڕانەو سەرکەوتنی سۆشیالیزمەوە دانرا. گرنگترین کۆنگرەکانی ئەنتەرناسیونالی یەکەم لە ساڵی ١٨٦٦ەوە هەر ساڵی جارێك وە هەر جارەی لە شارێك وەکو شارەکانی جنێف، لۆزان، بروکسەل، بازل.. بەستران.

ئەنتەرناسیونالی یەکەم لە دژی ئانارشیزم کە لە ئەسپانیاو ئیتالیا لایەنگریان هەبوو کەوتە چالاکی نواندن، مامۆستایانی ئەم ڕێبازە ماهییەتی دژی پرۆلیتاریو گێرە شێوێنیی ئانارشیزمیان ئاشکراکردو سەرکەوتنی سۆشیالیزمی زانستییان مسۆگەر کرد.

لە کاتی ڕاپەڕینی کۆمۆنی پاریسدا، ئەنتەرناسیونالی یەکەم گەلێك چالاکیی نواندو پشتگیریی لەو ڕاپەڕینە قارەمانانەی کرێکارانی پاریس کرد. لە دوای تێکشکاندنی کۆمۆنی پاریس گەلێك چالاکی لە دژی تیرۆری خوێناویی بۆرجوازیی فەرەنسە نواند، هەروەها لە دوای تێکشکاندنی کۆمۆنی پاریس لە هەموو وڵاتەکاندا چوون بە گژ ئەنتەرناسیونالی یەکەمدا. عونسورە ڕاڕاو ڕووخاوەکان دوورە پەرێز وەستانو کەنارگیرییان کرد. بەرەبەرە چالاکیی ناوەندیی کرێکاری ئەنتەرناسیونالی یەکەم لە ئەوروپادا نەما. بەم جۆرە لە ساڵی ١٨٧٢ لە کۆنگرەی لاهای بڕیاردرا کە ناوەندی ئەنتەرناسیونالی یەکەم بگوێزرێتەوە بۆ نیویۆرك. چوار ساڵ دوای ئەوەش لە کۆنفرانسی (فیلادلفیا) دا ئەنتەرناسیونالی یەکەم بە ڕەسمی هەڵوەشایەوە.

**ئەنتەرناسیونالی دووەم:**

وەکو ڕێکخراوێکی نێونەتەوەیی ڕێکخراوە سۆشیالیستییەکان لە ساڵی ١٨٨٩ لە کۆنگرەیەکدا کە لە پاریس بەسترا دامەزرا، لەو ڕێکخراوەدا حزبە کرێکارییەکانی نزیکەی هەموو وڵاتە ئەوروپاییەکانو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئەرجەنتین بەشداربوون. ئەنتەرناسیونالی دووەم لە ماوەی شەش ساڵی سەرەتای دامەزراندنیدا گەلێك یارمەتیی بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانەو پێشکەوتووانەی سۆشیالیستی زانستیو بەهێزکردنی حزبو ڕێکخراوە کرێکارییەکانی جیهانیدا. ئەو ڕێکخراوانە بەرەبەرە بوونە هێزێکی سیاسیی گرنگ لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپاییەکان. پاش ماوەیەك ڕابەریکردنی ئەنتەرناسیونالی دووەم کەوتە دەست ئەپۆرتۆنیستەکان. ئەمانە بوونە هۆی ئەوە کە بیروباوەڕو شێوازی بۆرجوازییانە لەناو ڕاپەڕینی کرێکاراندا بخوڵقێو بەهێزبێت، بەڵام لەناو ئەوانەدا هەندێك ڕێکخراوو گرۆی سیاسی خۆیان بە تیۆری شۆڕشگێڕانەوە بەستەوەو بە توندی کەوتنە بەربەرەکانێی ڕەوشتی خۆبەدەستەوە دەرانەو هەڵوێستی ڕیفۆرمیستانەی ڕابەرە ئەپۆرتۆنیستەکان.

ئەم بەربەرەکانێیە، بوو بە هۆی جیاکردنەوەی باڵێکی چەپی شۆڕشگێڕ لەناو ڕیزەکانی ئەنتەرناسیۆنالی دووەمدا. زۆربەی ڕابەرەکانی ئەنتەرناسیۆنالی دووەم لە دوای هەڵگیرساندنی یەکەمین جەنگی جیهانی لە ساڵی ١٩١٤دا بە ئاشکرا بوونە پاشکۆی بۆرجوازی وڵاتەکانی خۆیان.. بە تەواوی لە شێوازی هاریکاریو پەیوەندیی پرۆلیتاریاو ئەنتەرناسیۆنالیزمی کرێکاران کشانەوە. لەو کاتەدا لە ناو ئەنتەرناسیۆنالی دووەمدا سێ ڕێباز پەیدا بوو، باڵێکی ڕاست یان بڵێین سۆشیال شۆڤێنیستەکان، ئەویتریان باڵێکی مامناوەندی ڕەو، سێیەمیشیان ئەنتەرناسیۆنالیستەکان یان بڵێین باڵی چەپ.

لە ساڵی (١٩١٥) لە "تسیمیرواڵد" لە سویس یەکێتیی سۆشیالیستەکانی ئەنتەرناسیۆنالیست دامەزرا.

ئەنتەرناسیۆنالی سێیەم، لە ڕێکخراوە شۆڕشگێڕییەکان پێکهاتووە. لە ساڵی ١٩١٩ تا ساڵی ١٩٤٣ درێژەی بە چالاکیی خۆیدا، ئەنتەرناسیۆنالیستی سێیەم ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕانەی نێونەتەوەییو ناوەندی ڕاپەڕینی کرێکارانی جیهان بوو. یەکەمین کۆنگرەیان لە مانگی مارسی ساڵی ١٩١٩دا بەست کە نوێنەری ڕێکخراوە شۆڕشگێڕییەکانی (٣٠)سیی وڵاتی جیهانی تیا بەشداربوو. بۆ یەکەمجار

نوێنەری ڕێکخراوە شۆڕشگێڕییەکانی وڵاتانی ئاسیا بەشدارییان تیادا کرد. بەر لەوە کۆبوونەوەیەکی ڕاوێژکاری لە مانگی کانوونی دووەمی هەمانساڵدا کرا کە نوێنەری هەشت ڕێکخراوی گەورە بەشداریی تیادا کرد، لەو کۆبوونەوەیەدا هەموو ڕێکخراوە شۆڕشگێڕیو سۆشیالیستییەکانی بۆ کۆنگرەی ئەنتەرناسیۆنالیستی بانگکرد. ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانە زۆر بە گورجی لە وڵاتەکانی ئاسیاو ئەوروپاو ئەمریکادا ڕیشەی داکوتاو زۆر شوێنو ناوچەی گرتەوە. هەروەها بە هۆی دەوری کاریگەرییەتیی ئەمەوە چەندان ڕێکخراوی شۆڕشگێڕانەی تر لە وڵاتە جۆربەجۆرەکانی تری جیهاندا دامەزران. کۆنگرەی دووەمیان لە ساڵی (١٩٢٠)دا بەسترا کە نوێنەری ٤١ چل‌ویەك ڕێکخراو بەشداریی تیادا کردبوو، بڵاوبوونەوەی کتێبی "نەخۆشیی منداڵانەی چەپڕەویی.."، ڕۆڵێکی زۆر گەورەی لە بواری ڕێکخستنو گەڵاڵەکردنی ئەو کۆنگرەیەدا گێڕا.. لە کاتی حەوتەمین کۆنگرەدا کە بە تایبەتی بۆ بەربەرەکانێی فاشیزم لە جیهاندا ئاراستە کرابوو (٧٦) حەفتاوشەش ڕێکخراوی گەورە بەشداربوون، کە لە مانە (٢٢) ڕێکخراویان ئاشکراو (٥٤)یان بە نهێنی چالاکیی خۆیان دەنواند. لە پاش هەڵگیرساندنی دووەمین شەڕی جیهانی هەموو ڕێکخراوە شۆڕشگێڕییەکان چالاکیی گەورەیان دژی فاشیزم دەستپێکرد.

ئەمەبوو بە کورتی مێژووی دامەزراندنو چالاکیی ئەنتەرناسیۆنال.

## ئەنتەرناسیۆنالیستی پرۆلیتاری - Internationalisme Proletarion

بریتییە لە سیاسەتو ئایدۆلۆجیی یەکگرتووی نێونەتەوەیی کرێکارانو هەموو زەحمەتکێشان. لە باری سەرنجی مێژووەوە بیری ئەنتەرناسیۆنالیزمی پرۆلیتاری یەکەمجار لە لایەن ڕابەرە گەورەکانی چینی کرێکارەوە زیاتر لە سەد ساڵ لەمەوبەرەوە[1] داڕێژراوە. پایەی تیۆریی ئەوەبوو کە کرێکارانو زەحمەتکێشانی هەر وڵاتێك لە دژی بۆرجوازی، لە پێناوی داکۆکی لەسەر سەرچاوەکانی ژیانی زەحمەتکێشان، سەقامگیربوونی دیمکراتییەتو سۆشیالیزم، تێبکۆشن، لە هەمان کاتدا کرێکارانو زەحمەتکێشانی هەموو وڵاتانی جیهان سەرچاوەکانی ژیانیان یەك دەگرێتەوەو هەموویان دوژمنێکی هاوبەشی چینایەتییان هەیە کە ئەویش بۆرجوازیی سەرتاسەریی جیهانە.

ناوەرۆکو مەفهومی ئەنتەرناسیۆنالیزمی پرۆلیتاری لە ماوەی ئەم سەد ساڵەی دواییدا، لە ئەنجامی گەشەکردنی کۆمەڵگەی ئادەمیزادو ڕێڕەوی مێژوو زیاتر یەکانگیربووە، تاکو سەرەتای سەدەی ئێستا مەفهومی ئەنتەرناسیۆنالیزمی پرۆلیتاری بریتیبوو لە یەکگرتنی نێونەتەوەیی زەحمەتکێشانی هەموو وڵاتان لە پێناوی لەناوبردنی سەرمایەداریو حکومەتکردنی چینی کرێکار، دوای ئەوە شێوەو ناوەرۆکی ئەنتەرناسیۆنالیزمی پرۆلیتاری بەهێزترو فراوانتر بوو.

ئەنتەرناسیۆنالیزمی پرۆلیتاری بنچینەی پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتە سۆشیالیستییەکانە.

## ★ئینقیلاب (شۆڕش)[*] - Revolution

شۆڕش گۆڕانێکی قووڵی بنەڕەتیو بونیاتنەرانەیە، سووڕانێکی گەورەو بنچینەییە لە ژیانی کۆمەڵگەدا.. شۆڕش لە زانستی کۆمەڵ شوناسیدا بریتییە لە لەناوبردنی ڕژێمێکی کۆمەڵایەتیی کۆنو ڕزیوو دانانی ڕژێمێکی کۆمەڵایەتیی تازەو پێشکەوتووانە لە جێگای.. واتە لەناوبردنی واقعێکی کۆنو یەك کەوتەو دانانی واقعێکی تازەو بە کەڵك لە جێگەی. بۆ نموونە: شۆڕشی گەورەی فەرەنسە کە نزیکەی دووسەد ساڵ لەمەوبەر[1] ڕوویدا شۆڕشێکی بۆرجوازییانە بوو، ڕژێمی فیۆدالی ڕزیوو ڕوخساری سەڵتەنەتی بوربونەکانی لەناوبردو ڕژێمی سەرمایەداری —کە لەو سەردەمەدا ڕژێمێکی تازەو پێشکەوتووانە بوو— لە جێگەی دانرا. شۆڕشی مەشروطەی ئێران شۆڕشێکی بۆرجوازییانە بوو، ئەگەرچی بە نیوەو ناتەواوییانە مایەوەو سەرکەوتنی تەواوی بەدەست نەهێنا، بەڵام دەستێکی توندی لە سیستەمی سەڵتەنەتیو بنچینەیی خانەدانێتیو فیودالی ڕزیوو وەشاندو ڕێگەی لەبەردەم گەشەکردنی کۆمەڵو بەشداریی کۆمەڵانی خەڵکی لە بواری دیاریکردنی چارەنووسی وڵاتەکەیاندا فراوانکرد. شۆڕشی ئۆکتۆبەر شۆڕشێکی کۆمەڵایەتییانە بوو، چونکە ڕژێمی کۆنو ڕزیوی فیودالیو سەرمایەداریی لە بنەڕەتەوە هەڵتەکاندو کۆمەڵگەیەکی تازەی سۆشیالیستیی بونیات نا کە ڕووداوێکی گەورەبوو لە مێژووی ژیانی ئادەمیزاددا.

شۆڕش گرنگترین قۆناغی گەشەکردنی ژیانی کۆمەڵە، دووربینیی سیاسییانە شۆڕش بە کارێکی حەتمی ناو ئەو کۆمەڵگایانە دەزانێت کە لە چەند چینێك پێکهاتوون.. لە هەموو ئەو کۆمەڵگایانەدا کە چەندان چینی جیا جیاو خاوەن قازانجی جیاجیایان تێدایە گەشەکردنی ئابووریو کۆمەڵایەتی قۆناغ بە قۆناغ هەڵو مەرجی گۆڕینی بنەڕەتیو بونیات نەرانە دەڕەخسێنێ. لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی گۆڕینی بونیات نەرانەی ڕژێمی کۆمەڵایەتی. لەم ڕووەوە وتراوە:

*"هێزە بەرهەم هێنەرەکانی کۆمەڵ لە قۆناغێکی تایبەتیی گەشەکردنی خۆیاندا لەگەڵ پەیوەندییەکانی بەرهەم هێناندا واتە لەگەڵ پەیوەندییەکانی موڵکدارێتیدا کە لەناو منداڵدانی ئەودا گەشەیان کردووە دەکەونە ناکۆکییەوە، پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان دەبنە کۆسپو بەرهەڵست لە ڕێگای گەشەکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکاندا، وە لەو کاتەدایە کە قۆناغی شۆڕشی کۆمەڵایەتی دەستپێدەکات".*

---

١–لە سەردەمی نووسینی کتێبەکەوە..

*لێرەدا ئینقیلاب بە مانای شۆڕش هاتووە.

١–لە کاتی نووسینی کتێبەکەوە..

شۆڕش هەموو ئەو ناکۆکییانە چارەسەر دەکات کە باسکران، ئەو پەیوەندییە کۆنانەی بەرهەمهێنان لەناو دەبات، پەیوەندیی تازە سەقامگیردەکاتو دەبێتە هۆی خۆشکردنی زەمینەی بە پەلە گەشەکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان.. ئەمەیە پایەی ئابووریو واقیعی شۆڕش.

شۆڕش چینێکی فەرمانڕەوا لەناو دەباتو چینێکی تر کە لە بواری پەیوەندیی بەرهەمهێناندا پێشکەوتووانە ترن لە جێگای دەسەلات دایدەنێت. دەتوانین بڵێین کە شۆڕش دەوڵەتێکی تازەو پێشکەوتووتر لە جێگای دەوڵەتێکی کۆنو دواکەوتوو دادەنێت.

مەسەلە بنچینەییەکانی هەر شۆڕشێك بریتییە لە دەسەلاتی سیاسیی دەوڵەت گرتنە دەست. وەرگرتنی دەسەلات لە دەست چینێکی دەسەلاتداری دواکەوتووانەو سپاردنی بە دەست چینێك یان چەند چینێکی پێشڕەوو پێشکەوتوو.. ئەمە ناوەڕۆکی بنچینەیی هەر شۆڕشێکە.. شۆڕش بەرزترین شێوەی ڕاپەڕینی چینایەتییە، چینە پێشکەوتووەکان لە ڕێگای شۆڕشو کەمکردنەوەی دەسەلاتی چینی فەرمانڕەوای کۆنەپەرستەوە ڕێگەی گەشەکردنی کۆمەڵ دەکەنەوە.

شۆڕشی کۆمەلایەتی قووڵترین گۆڕین لە بواری سیاسیو ئابووریو ئایدۆلۆجیی کۆمەڵدا پێك دەهێنێت. لە بنەڕەتەوە ڕوخساری کۆمەڵ دەگۆڕێت. ئاشکرایە هەندێك گۆڕان یان کرداری چارەسەرییانە "ریفۆرمیستی" یان پێشکەوتووانە لە چوارچێوەی ڕژێمێکی کۆمەلایەتیی دیاردا، یان لەناو دەسەلاتی سیاسیی دەوڵەتێکدا یان چینی فەرمانڕەوا، ئەمە نابێتە شۆڕش. ئەگەر چی دەزگاکانی پروپاگەندەو ڕاگەیاندن هەرچەند بە شانو باڵیدا هەڵبخوێنن.

لەو ڕوونکردنەوانەی سەرەوەدا ئاشکرایە کە بە پێی قۆناغی گەشەکردنی ئابووریو کۆمەلایەتیو ڕاپەڕینی چینەکان دەتوانین چەند جۆر شۆڕشی کۆمەلایەتی دەستنیشان بکەین، وەکو: شۆڕشی بۆرجوازی، شۆڕشی بۆرجوازی–دیموکراتی، شۆڕشی سۆشیالیستیو چەندانی تر.. پێویستە ئەوە بزانن کە هەر شۆڕشێك چ جۆرە گیروگرفتو ناکۆکییەك لەناو کۆمەڵدا چارەسەر دەکات. چ ئەرکێکی کۆمەلایەتی دەگرێتە ئەستۆی خۆی، دەسەلات لە دەست چ چینێك وەردەگرێتو دەیداتە دەست چ چینێکی تر، وەیان شۆڕش بە چ چینێك دەسپێردرێت. بەم پێیە دەتوانین جۆری ئەو شۆڕشە کۆمەلایەتییە دیاری بکەین. بۆ نموونە: شۆڕشی ئۆکتۆبەر شۆڕشێکی سۆشیالیستیانە بوو، شۆڕشی فەرەنسەو شۆڕشی مەشروطیەت لە ئێراندا ئەمانە شۆڕشی بۆرجوازییانە بوون.

ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە دەسەلاتی دەوڵەت سەندنەوە لە چینێكو بدرێتە دەست چینێکی تر ئەمە مانای شۆڕش نییە، چونکە بەو جۆرەی کە وتمان مەفهوومی شۆڕش ئەوەیە ئەو چینەی کە دەسەلات دەگرێتە دەست لە چینەکەی پێشوو پێشکەوتووانە تر بێت، بە جۆرێك کە ڕێگەی گەشەکردنی کۆمەڵ فراوان بکات. ئەگەرنا ئەگەر چینێکی دۆڕاوو کۆنەپەرست بتوانێت چینێکی پێشکەوتوو لاببات یان ژێردەستە بکاتو دەسەلات بگرێتە دەست خۆی ئەوا ئەم کارە کارێکی ناشۆڕشگێڕانەیەو لە هەمان کاتدا دژی شۆڕشە.. شۆڕش بە بەشداریی کۆمەلانی خەڵك بە ئەنجام دەگات. هیچ ڕوخسارێکی لە کودەتاو گۆڕینی وەزعی دەربار ناچێت. هەر شۆڕشێك پێویستیی بە زەمینەی شۆڕشو هەلومەرجی شۆڕش هەیە وەکو باری شۆڕشگێڕانەو بوونی ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕانە.

## شۆڕشی فەرهەنگی(١) - Revolutionculturelle

شۆڕشی فەرهەنگی بەشێکە لە شۆڕشی سۆشیالیستی، مەفهوومی ڕاپەڕینی خەڵكو هێنانەدیی فەرهەنگێکی تازەیە، واتە فەرهەنگی سۆشیالیستیو هەست پێکردنو هەزمکردنی ئەم ئایدۆلۆجیو فەرهەنگە سۆشیالیستییەیە لە لایەن کۆمەلانی زەحمەتکێشەوە.

لە کاتی شۆڕشی سۆشیالیستیانەدا دەسەلاتی زەحمەتکێشان سەقامگیر دەبێت، هەموو بەرهەمە سۆشیالیستییەکانو پەیوەندییە بەرهەمهێنەرەکان بە تەواوی تازە دەبنو دەوڵەتی سۆشیالیستی دادەمەزرێ. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوە کە شۆڕشی فەرهەنگی سەربگرێ. فەرهەنگی تازەو سۆشیالیستی بە تەواوی سەقامگیر دەبن.. شۆڕشی فەرهەنگی لەم قۆناغەدا گۆڕینێکی بونیاتنەرانە بە سەر باری فەرهەنگیی کۆمەلانی خەڵکدا دێنێت. ئەم گۆڕینەش لەسەر پایەی توانای تازەی ئابووریو کۆمەلایەتیو هەلومەرجی تازەی ماددیو سیاسی دەبێت.

شۆڕشی فەرهەنگی چەندان لایەنی هەیە وەکو: کارکردنی پێشکەوتووانەو بێ وێنە لە بواری فێرکردنو پەروەردەکردندا، لەناوبردنی نەخوێندەواری، سەپاندنی خوێندنی پلەی سەرەتایی بەسەر هەموو خەڵکدا، پەروەردەکردنی سیاسییانەی خەڵك، بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی سیاسیی خەڵك، پەروەردەکردنی گیانی نوێخوازی، پێگەیاندنی ڕۆشنبیری تازە، لەناوبردنی حاڵەتی دواکەوتنی فەرهەنگی، زیندووکردنەوەی کەلەپووری هونەریو ئەدەبی پێشینانو.. هەروەکو چۆن لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بایەخی پێدەدرێت.

**شۆڕشی سۆشیالیستی:**

شۆڕشی سەرکەوتووی پرۆلیتاریایە کە گۆڕانێکی بنچینەیی بونیاتنەرانە لە مێژووی کۆمەڵگای ئادەمیزاددا بەدی دەهێنێت. گەورەترین تۆماری جیهانی کۆنی سەرمایەداری دەدڕێو جیهانی نوێی سۆشیالیستی بونیات دەنێت، بۆ نموونە وەکو: شۆڕشی ئۆکتۆبەر، بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا دەسەلاتی چەوسێنەرەکانی لەبن هێناو لەناویبردن، کۆمەڵگایەکی تازەی بێ ستەمی چینایەتیی

١–فەرهەنگ لێرەدا بە مانای کولتورە نەك (قاموس)..

هێنایە کایەوە ، لە ئەنجامی شۆڕشی کۆمەڵایەتیدایە کە ڕژێمی کۆنەو دژی خەڵك جێگەی خۆی بۆ ڕژێمێکی تازەی دەست نیشاندەی خەڵك چۆڵدەکات. شێوەیەکی تازەی بەرهەمهێنان جێگەی شێوە کۆنەکانی بەرهەمهێنان دەگرێتەوە.

شۆڕشەکانی تاکو سەدەی ڕابوردوو ئەگەرچی ڕۆڵێکی دیاریان لە گەشەکردنی کۆمەڵدا دەگێڕاو پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لە چاو ڕابوردوو پێشکەوتووانەتر دەبوو، بەڵام لە هەریەك لەم حاڵەتانەدا سیستمی کۆمەڵایەتی لەسەر بنچینەی بەهرە لە یەکتر وەرگرتن دامەزرابوو، بۆنموونە: فیوالیزم جێگەی کۆیلەیەتیی گرتەوە، سەرمایەداریش جێگەی فیودالیزمی گرتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا بنچینەکانی بەرهەمهێنان هەروەکو خۆیان دەمانەوەو بەهرە وەرگرتنو ستەمی چینایەتی لە هیچ سەردەمێکیاندا پیشەکێش نەدەکران.. تەنیا سپاردنی کۆمەڵ بە سیستمی سۆشیالیستی بوو کە دەیتوانی پێگەیشتووترین هەلومەرج بۆ گەشەکردنو مانەوەی هێزە بەرهەمهێنەرەکان بڕەخسێنێت، بەهرە وەرگرتنی کەسێك لە کەسێکی تر لەناوبەرێت.. زەمینەیەکی بێ سنوور بۆ سەربەستیی مرۆڤ، فەرهەنگو زانستیو هونەر بهێنێتە کایەوە. ئەمە قۆناغێکی ماهیەت تازەو لەڕووی چۆنایەتیشەوە لە مێژوودا بێ وێنەیە. شۆڕشی سۆشیالیستی چەسپێنەری سەرەتای ئەم قۆناغەیە.

شۆڕشی سۆشیالیستی ئەهمیەتێکی گەورەی جیهانی–مێژوویی هەیە، ئەم شۆڕشە بنچینەکانی سەرمایەداریی دنیا دەهێنێتە لەرزین بەشێکی ئەو جیهانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزمدا دەچەوسێتەوە ڕزگاری دەبێت.. هەوڵو تەقەللای سیستمی موستەعمەراتی ئیمپریالیزم ئیفلیج دەکاتو شەپۆلی ڕاپەڕینی کرێکارانو ڕاپەڕینی ئازادیخوازانەی گەلان دەبنە هۆی بونیاتنانی سیستمی تازەی سۆشیالیستی.

### ★ئانکیزیسیۆن - Inquistion

ئەم وشەیە بە مانا پشکنینی بیروباوەڕ دەگرێتەوە، بە دادگا تایبەتییەکانی کلێسای کاثولیکەکان وتراوە کە بە فەرمانی پاپ دەجووڵانەوەو ئامانجیان سەرکوتکردنی هەموو ئەو کەسانە بووە کە سەرپێچییان لە فەرمانەکانی پاپ دەکرد.. لەو دادگایانەدا هەر ئازادیخواز، یان پێشکەوتنخوازێکیان بە بیانووی بێ دینو لادەر لە ڕێگەی ئایین سزا دەدا، دەیانخستە زیندانەوە، ئازاریان دەدان، دەیانکوشتن، بە زیندوویی دەیانسووتاندن، ئەم دادگا پڕ لە ستەمکارییانە لە سەدەی سیازدەیەمی زاینیدا دامەزران. بە درێژایی ماوەی سەدەکانی ناوەڕاست بوو بوونە چەکی دەستی کلێسا کاثولیکەکانو ڕژێمی فیودالی.. لەو سەدانەدا چەندان زاناو دانشمەندو ئەدیبو ڕۆشنبیرو نووسەرو پزیشكو هونەرمەندو پیاوی دەرکەوتوو ئازادیخوازو زۆرلێکراوو چەندان کۆمەڵ خەڵکی سادە –کە کلێسا ڕقی لێیان دەبووەوە– بوونە قوربانیی ئانکیزیسیۆن. هەموو دادگاکان خەڵکیان بە بیانووی بێباوەڕی دەکوشت، گوایە باوەڕیان بە کلێسا نییە، ئەو دادگایانە دڕندانەترین شێوەی ئازاردانی خەڵکیان بەکار دەهێنا کە تا ئێستا ناوو ناوبانگی ماوە.

هەروەها ئانکیزیسیۆن وەکو ئالەتێك وابوو بە دەست ستەمکارانو فەرمانڕەوایانی کلێساوە بۆ کۆکردنەوەی دەرامەتی تایبەتیی خۆیان. زۆربەی ئەو کەسانەی کە دەیانکوشتن دەستیشیان بەسەر ماڵو سامانەکانیاندا دەگرتو تاڵانیان دەکردن.

### ★ئومانیسم - Humanisme

سیستمێکی بیروباوەڕییە کە لە رووکاری تایبەتی یان خۆشەویستیو مرۆڤ دۆستیو پەیوەندیی دۆستانەو بەختیاری ڕێزگرتنی تیا دەردەکەوێت.. لە باری سەرنجی مێژووییەوە سیستمێکی فیکریی بەو جۆرە لە سەدەکانی (١٤و١٦)ی زاینیدا وەکو ڕاپەڕینێکی کۆمەڵایەتیو ئەدەبی دەرکەوت کە لە کرداردا دژی ئایدۆلۆجیی فیودالیو توێژە مەزهەبییەکان بوون. ئەم سیستمە لەو کاتەدا لە لایەن کۆمەڵێك ڕۆشنبیرەوە پەیڕەویی دەکرا کە لە پێناوی لەناوبردنی سیستمی فیودالیدا هەوڵی سەرکەوتنی ڕاپەڕینی بۆرجوازییانەیان دەدا. ڕۆشنبیرانو ماتەریالیستەکانی فەرەنسە لە سەدەی هەژدەیەمدا دەرکەوتووترین نموونەی شێوازی فیکری ئومانیستییان خستە ڕوو. ئەوانە بوون کە دروشمی "ئازادی، یەکسانی، برایەتی" یان بەرزکردبووەوە، بەڵام ئەم دروشمە هاوکاتی گۆڕانی سەرمایەداری بوو لەناو چوارچێوەی قازانجی بۆرجوازیدا خۆی گرت. تا ئەو کاتەی داوای ئازادیو خەڵك نەچەوساندنەوەیان کرد، ئەوەبوو فاشیزمو میلیتاریزم لەناویان بردن.

مەفهوومی ئومانیزم لەلایەن بەخەیاڵ سۆشیالیستەکانی وەکو: سان سیمون، فورییە، ئوین.. تەنیا ناوەرۆکێکی کۆمەڵایەتیی تازەی هەبوو، بەڵام لە واقیعدا بریتییە لە مرۆڤ دۆستیی واقیعی. ئامانجی ئومانیزم سۆشیالیستیو ئازادیی تەواوی زەحمەتکێشانە.

### ★ئایدیۆلۆجی - Ideologie

ئایدیۆلۆجی بریتییە لە سیستمی تیۆریو بیرکردنەوەی سیاسی، ماف، هونەری، مەزهەبی، فەلسەفی.. تیۆری لە زەمینەی ڕەوشتدا. ئایدیۆلۆجی بەشێکە لە سەرخانی فیکریی کۆمەڵو خاسییەتی چینایەتییانەی هەیە، لەبەر ئەمە پەیوەندییە ئابوورییەکانی ژێرخانی کۆمەڵ نیشان دەدات.

لە کۆمەڵگەیەکی چینایەتیدا ڕاپەڕینی چینایەتی جەنگی ئایدیۆلۆجییە.. قازانجی چینە کۆنەپەرستەکان لە کاتی سەرەمەرگدا هەوڵدەدەن کە واقیعییەت لەناو بچێو ڕاستی بکرێت بەژێر پێوە.. لەبەر ئەوە ئایدیۆلۆجیی ئەو چینە کۆنەپەرستانە ڕاست نینو ڕاستی دەرنابڕنو شتێکی زانستیانە نین، بەپێچەوانەی قازانجی چینە پێشکەوتووە شۆڕشگێڕەکانەوە کە ئایدیۆلۆجییان واقیع دەردەبڕێت.

لەم دوایییەدا[1] فەیلەسووفەکانی بۆرجوازی کەوتوونەتە پروپاگەندە کردن کە گوایا ئایدیۆلۆجی پێویست ناکات تێکەڵ بە زانستو واقیع بکرێت.. ئەوانە ئایدیۆلۆجی بە کارێکی دەروونی دەزانن، وەها داوادەکەن کە دەبێت فەلسەفەو زانین لە هەر جۆرە ئایدیۆلۆجییەك دووربن.. ئەمەش تەنیا ئەوە دەگرێتەوە کە دەیانەوێت زانستو فەلسەفە لە ڕاپەڕینی چینایەتیو واقعییەتی کۆمەڵ جیابکرێتەوە. مەبەستی سەرەکیی ئەم داخوازییەشیان تەنیا ئەوەیە ئایدیۆلۆجی شۆڕشگێڕانە کە تەنیا ئایدیۆلۆجی واقیعیو زانستیانەیە لە واقیع دوور بخرێتەوە.

گەشەکردنی ئایدیۆلۆجی هەرچەندە بەستراوە بە پەیوەندییەکانی ئابوورییەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا تاڕاددەیەك سەربەخۆیی هەر هەیە. جۆری ئەم سەربەخۆییە بە "تایبەت" دەبینن کە ناتوانرێت ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆجی بە بێ هۆو ڕاستەوخۆ تێکەڵ بە باری ئابووری بکرێت.. جگە لەوە گەشەکردنی هۆیەکانی ئابووریو ئایدیۆلۆجی هاوشانی یەك نین. سەربەخۆیی ئایدیۆلۆجی بەهۆی کاریگەرێتیی گەشەکردنی ئایدیۆلۆجیو، پێشکەوتنی سیستمی تیۆریو بیرکردنەوە –کە ئەمانە هیچ ماهییەتێکی ئابوورییان تیا نییە– سەردەگرێت. هەروەها بە زۆری چەند ئایدیۆلۆجییەکی جیا جیا کار دەکەنە سەر گەشەکردنو سەربەخۆیی یەکتر.

### ★ئانتی سمیتیزم - Anti-Smeitisem

لە زمانە ئەوروپاییەکاندا بە مانای "دژی سامی" هاتووە، بەڵام بە شێوەی تایبەتی بە مانای "دژی جوولەکە" لێك دەدرێتەوە. لە ئەورووپای سەدەی بیستەمدا دوژمنایەتیکردنی جوولەکە کە لەسەر شێوازێکی ئاینییانە بوو گۆڕدرا بە دوژمنایەتییەکی ڕەگەزی، ئەڵمانیا بوو بە مەڵبەندی توندوتیژیی ئەم دوژمنایەتییە، کە دوژمنایەتیی جوولەکەکان بکات بە شێوەی ڕەگەزایەتی.. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا لەگەڵ پەیدابوونی چەندان تیۆریدا لایەنگرانی ئەم بیروباوەڕە گەلێك هەوڵیان دا پایەی زانستییانە بۆ ئەم تیۆرییە دابنێن.

بەڵام گەورەترین هۆی پەیدابوونی ئەم تیۆرییە لە ڕاستیدا گەشەکردنی باری ئابووریی جوولەکەکان بوو کە لە کاروباری بازرگانیو پیشەییدا گەلێك باڵادەستو پێشکەوتوو بوون. هۆیەکی تریش ئەو گێژاوە ئابووریو کۆمەڵایەتییەی ئەڵمان بوو کە لە دوای تێکشکاندنی یەکەمین شەڕی جیهانی ڕوویدا تیایدا کە هیتلەرو هاوکارەکانی ئەمەیان بەهۆی بوونی ڕەگەزی جوولەکە دەزانی.. لە ئەڵمانیای نازیدا هیتلەر چەند یاسایەکی دانا کەبوو بە هۆی دوورخستنەوەی ئەنیشتاینو فرۆیدو چەندان زانای گەورەی تر لەوڵاتدا.

بەرهەمو شوێنەواری مۆسیقازانەکانی وەکو مندلسنو ئافنباخ بە تەواوی قەدەغەکران. جوولەکەکان لە هەموو مافێکی شارستانیو ئیشکردنی بازرگانیو پیشەیی بێبەش کرانو دەستە بەدەستە دەیاننادرن بۆ ناو ئۆردوگا زۆرە ملێکانو زیاتر لە پێنج ملیۆن کەسیان لێ لەناوچوو.

لە سەدەی نۆزدەیەمو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ئەورووپای ڕۆژهەڵات بوو بە مەڵبەندی بڵاوبوونەوەی پروپاگەندەی دژی جوولەکە.. وە هەر لەو کاتو سەردەمو شوێنەدا بوو بزووتنەوەی زایۆنیزم دەستپێکرد لەو وڵاتانەدا، لەگەڵ ئەوەدا لە ساڵی (١٩٥٤) بە دواوە یاسای بنچینەیی ڕێزی هەموو نەژادو ڕەگەزو نەتەوەو ئاینەکان وەکو یەك دەگرێ، کەچی لە هەمان کاتدا –تاڕاددەیەك– شوێنەواری دژی جوولەکە بەدی دەکرێتو ڕۆژنامەو ڕادیۆی هەندێك لە دەوڵەتانی ئەوروپا[1] جاروبار پەلاماریان دەبەنە سەر.

### ★بایکۆت - Boycottage

دەتوانین ئەم زاراوەیە بە مانای "بێبەشکردن" لێك بدەینەوە، مەبەست لەم بێبەشکردنەش شێوازێکی بەربەرەکانێی سیاسییانە یان ئابوورییانەیە کە بریتییە لە دابڕینی پەیوەندیی لەگەڵ کەسێکدا، یان ڕێکخراوێك، یان دەوڵەتێك.. بۆ نموونە: ئەگەر وتمان "خەڵك کەلوپەلی دەرەوەیان بایکۆت کردووە" مانای ئەوەیە کە خەڵك کەلوپەلی دەرەوە ناکڕنو لێی دوور دەکەونەوە. یان نموونەیەکی تر بڵێین: با دەوڵەتی ئەفریقای خواروو بایکۆت بکەین.. واتە با پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی ئەفریقای خوارووا ببڕین.. یان نموونەیەکی تر: لە گەڕەکێکدا خەڵك هەست بەوە دەکەن کابرایەك خراپە، دەڵێن با ئەو کابرایە بایکۆت بکەین، واتە هیچ جۆرە قسەو ڕازو نیازو مامەڵەو پەیوەندییەکی لە گەڵدا نەکرێت.

ئەوەش بڵێین کە بایکۆت کردن دوو ڕواڵەتی هەیە: پێشکەوتووانەو کۆنەپەرستانە.. وە دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەم بایکۆت کردنە لەگەڵ کێدا دەکرێت وە بۆ چ مەبەستێك دەکرێت؟ تاکو بزانین ئایا ڕوواڵەتە پێشکەوتووانەکەیە یان کۆنەپەرستانەکە.

ئەو نموونانەی هێنامانەوە بۆ نموونەی بایکۆتی پێشکەوتووانەیە، بەڵام دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکانیش وەیان کاربەدەستانی دەزگاو دامەزراوە سەرمایەدارییەکان ئەمکارە لە دژی دەوڵەتە سۆشیالیستییەکانو کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێش بەکاردەهێنن.

ئەم وشەیە لە ئەسڵدا ناوی ئەفسەرێك بووە لە کاتی ناکۆکیی نێوان بەریتانیاو ئێرلەندە کە لەسەر سەربەخۆیی ئێرلەندە ناکۆك بوون، ئەو ئەفسەرە ناوی بایکۆت بوو تەگبیری بۆ ئێرلەندییەکان کرد کە هیچ جۆرە کەلوپەلێکی بەریتانیا نەکڕنو پەیوەندیی مامەڵەو مامەڵەکاریی لەگەڵدا ببڕن. ئیتر بە ناوی ئەو ئەفسەرەوە ئەمکارە ناونرا بایکۆت..

### ★بلانکیسم – Blankisme

---

١–سەرەتای سەدەی بیستەمو کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دەگرێتەوە.

١–بە تایبەتی ڕۆمانیاو پۆڵەندە..

ناوی جۆرە ڕاپەڕینێکی پێشکەوتووانەیە کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا لە فەرەنسە ڕوویدا ئەم زاراوەیە پەیوەندیی بە ناوو چالاکیی "ئۆگوست بلانکی"ی شۆڕشگێڕی بەناوبانگەوەیە. ناوبراو لەو باوەڕەدا بووە کە دەتوانێت بە ڕاپەڕینی کۆمەڵە شۆڕشگێڕێکی بچووك دەسەڵاتی سەرمایەداری لەناو ببات، بێ ئەوەی کۆمەڵانی خەڵك پشتگیریی لێبکەن، وە هەر بە هۆی ئەو کۆمەڵە بچووکەوە دەتوانێت بگاتە سۆشیالیزم.

ئێستا مەفهوومی بلانکیزم بریتییە لە تاکتیكو پیلانی کۆمەڵێکی بچووك کە پشت بە کۆمەڵانی خەڵك نەبەستێت، بلانکیستەکان باوەڕیان بە جەماوەرو یەکگرتنی ڕێکخراوەکان نییە.. ئەمانە بە لایانەوە کەم بایەخن.

ئەمە مەفهوومی گشتیی ئەمڕۆی بلانکیزمە.. پێویستە ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە "لوئی ئۆگوست بلانکی"١٨٠٥–١٨٨١" یەکێك بووە لە شۆڕشگێڕە دەرکەوتووەکانی فەرەنسە، کە چالاکیو خۆ فیداکاریی ئەو لە مێژووی ڕاپەڕینی کرێکارانی فەرەنسەو جیهاندا ئاشکرایە.. ئەو زیاتر لە شەست ساڵ تەمەنی خۆی سەرۆکایەتیی ئەم جۆرە ڕێکخراوو کۆمەڵە نهێنییانەی کردووە. دوو جار خۆی بۆ کودەتا ئامادەکردووە، دوو جار حوکمی مردنی دراوە، هەردوو جارەکە حوکمەکەیان بۆ کردووە  بە زیندانیی هەمیشەیی، زیاتر لە چل ساڵ حەپس بووە، لە ساڵی ١٨٧١ کاتی یەکەمین ڕاپەڕینی کرێکارانی فەرەنسە –کۆمۆنی پاریس– هەرچەند دوور بوو لە ڕاپەڕینەکەوە، بەڵام کرا بە ئەندامی کۆمۆنو ڕێزی لێگیرا.

دوو ساڵ بەر لەوەی بمرێت بێ ئەوەی خۆی لە ئارادا بێت بۆ ئەندامی ئەنجومەن هەڵبژێردرا. بەو هۆیەوە لە زیندان بەرەڵلا کرا. بەکارهێنانی شێوەی شۆڕشگێڕییەکەی لە پێناوی گۆڕینی کۆمەڵدا ڕەت دەکردەوە، ئەمڕۆش بەو چەپڕەوانەی کە بایەخ بە پێگەیشتنی ڕادەی کۆمەڵ بۆ شۆڕش، بوونی هەلومەرجی لەبارو پێویستیی ڕاپەڕینو داخوازیی سیاسیو تاکتیكو ستراتیج نادەن، دەتوانین ناوی تازە بلانکیزم "نیو بلانکیزم" یان لێ بنێین.

### ★بۆرجوازی - Bourgeoisie

لە فۆرماسیۆنی کۆمەڵایەتی–ئابووریی سەرمایەداریداو چینی بنچینەیی: پرۆلیتاریاو بۆرجوازی هەیە.. بۆرجوازی بریتییە لە چینی سەرمایەداران، واتە ئەو کەسانەی کە هۆیە سەرەکیو بنچینەییەکانی بەرهەمهێنانیان وەکو: کارخانەو فابریقەو بانقو هۆیەکانی گواستنەوەو دابەشکردنو.. بە دەستەوەیەو سوود لەکاری خەڵكو ڕەنجی کرێکاران وەردەگرن.

لە ڕووی باری زمانەوانییەوە ئەم زاراوەیە لە وشەی "بۆرگ" کە بە مانا "شار" دەگرێتەوە وەرگیراوە. کە بە دانیشتووانی شارەکانیان دەوت "بۆرجووا"

لەبەر باری سەرنجی مێژوویشەوە بۆرجوازی لە مندالدانی کۆمەڵگای فیودالیدا دەخەملێو لە قۆناغی لەناوچوونی کەلوپەلی وردەواڵەیدا پەیدا دەبێتو گەشە دەکات.. هەروەها لە قۆناغی پەرەسەندنی سەرەتایی سەرمایەدارو لەناوبردنی خاوەن بەرهەمهێنەرە بچووکەکانو کردنیان بە کرێکاری ڕۆژانە وەکو چینێك دەردەکەوێت.

دوای ئەوە لە ماوەی چەندان سەدەی پڕ لە بەربەرەکانێدا توانیویەتی دەسەڵاتی سیاسیو ئابووریی خۆی سەقامگیر بکات. شۆڕشی بۆرجوازییانە ئەو شۆڕشەیە کە دەسەڵاتی فیودالیزم تێك دەشکێنێت، بۆرجوازی ڕابەرایەتیی دەکاتو لە ئەنجامدا دەسەڵاتی خۆی لە ناو کۆمەڵدا دەچەسپێنێت.

ئەمجۆرە شۆڕشانە لە سەدەکانی حەڤدەیەمەوە تا نۆزدەیەمی زایینی ڕوویداوە. لەو ڕۆژگارانەدا بۆرجوازی چینێکی پێشکەوتووانەی سەردەمی خۆی بووە، چونکە داوای پێشکەوتنی کۆمەڵو لەناوبردنی فیودالیزمی دەکرد. قازانجی ئەم چینە بەسترابوو بە هێزە بەرهەمهێنەرەکانەوە، بەڵام دوای پێگەیشتنو گەشەکردنی کۆمەڵگای سەرمایەداری، بۆرجوازی بوو بە چینێکی کۆنەپەرستانە.

لە قۆناغی ئیمپریالیزمدا–کە دوا قۆناغی سەرمایەدارییە– ماهیەتی کۆنەپەرستیو ئەنگلی بۆرجوازی زیاتر لە هەر کاتێکی تر دەردەکەوێت. قازانجی بۆرجوازی بە هیچ جۆر لەگەڵ قازانجی کرێکارانو زەحمەتکێشاندا یەك ناگرنەوە.. ناکۆکیی نێوان بۆرجوازیو پرۆلیتاریا ناکۆکییەکی سەرومالییە.. ئەم ناکۆکییە بنچینەی ڕاپەڕینی چینایەتییە کە لە ئەنجامدا دەبێتە خۆی بەرپابوونی شۆڕشی سۆشیالیستیو لەناوبردنی سەرمایەداریو سەقامگیربوونی موڵکداریتیی هەرەوەزیو هۆیەکانی بەرهەمهێنان دەبێتە موڵکی تێکڕای گەل.

بۆرجوازی دەبنە چەند بەشێکەوە" هەر بەشە سەرمایەی خۆی لە بوارێکدا دەخاتە کار وەکو: بۆرجوازیی سنعەتکار، بۆرجوازیی بازرگان، بۆرجوازیی خاوەن بانق، بۆرجوازیی لادێ کە پێی دەڵێن "کوڵاك". سەرچاوەی قازانجی هەموو ئەمانە کارپێکردنی زیادی کرێکارانە.

### ★بۆرجوازیی کۆمپرادۆر-B-Comprador

توێژێکی دەوڵەمەندی دەرکەوتوون لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا، کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ دەزگا ئینحیسارییەکانی بێگانەدا هەیەو سەرمایەکانیان لەگەڵ سەرمایەی ئیمپریالیستیدا تێکەڵ کردووە. قازانجیان داکۆکی لەسەر پاراستنو مانەوەی قازانجی بێگانە دەکات.

زاراوەی "کۆمپرادۆر" لە زمانی ئەسپانییەوە وەرگیراوە، کە بە مانا کڕیار دەگرێتەوە زۆربەیان بازرگانی گەورەو خاوەن کارگەی مونتاجن، کە بەشێکە لە دەزگا سنعەتییە ئیمپریالیستییەکان، خاوەن بانقەکان بە هۆی تێکەڵیی سەرمایەکەیانەوە لەگەڵیاندا پەیوەندییەکی تەواویان هەیە.

بۆرجوازیی کۆمپرادۆر–Comprador ئامێری دەستی سیاسەتی ئیمپریالیزمە، دوژمنی سەرسەختی سەربەخۆیی نیشتمانییە، دوژمنی هەموو جۆرە ڕاپەڕینێکی ئازادیخوازانەیە، هۆی تاڵانکردنو دەست بەسەردا گرتنی ئابووریو دەسەڵاتی سیاسیی ئیمپریالیستەکانەو خۆیشی سوود لەو کارانە وەردەگرێو خاوەنی کۆنەپەرستانەترین بیروباوەڕو دژی نیشتمانی ترین ڕێبازی سیاسەتە.

ڕاپەڕینی ئازادیخوازانەی گەلان، نەک تەنها دژی ئیمپریالیستەکانی دەرەوەیە، بەڵکو بە توندی دژی ئەم نۆکەرانەی ئیمپریالیزم دەوەستێو هەوڵی لەناوبردنیان دەدات.

**★بۆرۆکراسی - Bureaucracy**

بە توێژی ئیداریی هەر دەزگاو ڕێکخراوێك دەڵێن کە بەڕێوەبەرێتییەکی فراوانی هەبێت، بە تایبەتی لە دەزگاو دامەزراوە دەوڵەتییەکاندا، هەندێك جاریش وەکو چینێك سەیریان دەکرێت.

لە بواری شیکردنەوەی چینایەتیدا بۆرۆکراسی بە چینێك دانانرێت.. بەڵکو بە ئامێری دەستی چینە فەرمانڕەواکان دادەنرێ.. لەبەر ئەمە لە بواری کۆمەڵ شوناسیدا دیسان لە دوای لەناوچوونی سەرمایەداری چاوەڕوانی هاتنەدیی هیچ جۆرە چینێکی تر ناکرێت، بەڵام هەندێك لە کۆمەڵ شوناسانو بیرکەرەوە سیاسییەکان دەم لە هاتنە کایەی چینێکی ترەوە دەدەن کە لەگەڵ نەهێشتنی موڵکدارێتیی تایبەتیو خاوەندارێتیی هۆیەکانی بەرهەمهێناندا موڵکدارێتیی هەرەوەزی دێتە کایەوە. لە جیاتی کاپیتالیزمی دەوڵەتی، کاپیتالیزمی تایبەتی دێتە پێشەوە.. ئەمانە خۆیان دەبنە چینێکی فەرمانڕەوا بەسەر خەڵکدا.

**★بەربەریسم - Barbarisme**

بەو مرۆڤانە دەوترێت کە لە ڕووی هێرشو بیرکردنەوەوە دواکەوتوو بن. کاتی خۆیو –تەنانەت ئێستاش[1]– لە هەندێك کاتدا بەو خێڵو خەڵکانەی ناوچەکانی ژووری ئەفریقایان دەوت، بەڵام ئەمڕۆ بە مرۆڤو خەڵکی دواکەوتووو دەستوەشێن دەڵێن.

**★پارلمان - Parlman**

پەرلەمان بە کۆمەڵی نوێنەران دەڵێن کە ئەرکی یاسادانانیان لە ئەستۆدایە، لە ئێرانو تورکیا پێی دەڵێن "مەجلیس" لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هەندێك وڵاتانی ئەمریکای لاتین "کۆنگریس"ی پێدەڵێن.

لە هەندێك وڵاتدا پەرلەمان لە دوو کۆمەڵ پێکدێت وەکو "شورا، سەنا" ئەنجومەنی ئەعیان–پیاو گەوران یا لۆردەکان– دەوڵەمەندەکان.

بە پێی یاسا ئەندامانی پەرلەمان لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێن، لە هەندێك شوێنیشدا بە میراتی دەبنە ئەندامی پەرلەمان. لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا لە ڕووی ماهییەتەوە دوو جۆر پەرلەمان هەیە:

لەو وڵاتانەی کۆماری پەرلەمانین وەکو: ئیتالیا، تورکیە، هیندستان..، یان لەو وڵاتانەی کە پاشایەتیی مەرجدارن (مەشروطەی سەڵتەنەتی) وەکو: بەریتانیا، سوید، دانیمارك..، پارلمان چاودێریی هەموو کاروبارێکی دەوڵەت دەکاتو بە گەورەترینو باڵاترین سەرچاوەی دەسەڵاتی دەوڵەت دەژمێردرێت. لەو وڵاتانەی تر کە سەرکۆمار دەسەڵاتی فراوانی هەیە وەکو "وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، فەرەنسە، چەند وڵاتێکی ئەمریکای لاتین.."، پەرلەمان تەنیا خەریکی ئەرکی یاسادانان دەبێت، کۆڕی وەزیران بەرپەرچی پەرلەمان ناداتەوە.

بەڵام وڵاتە دیکتاتۆرییەکان ئەگەرچی بە ڕواڵەت ئەنجومەنی پەرلەمانیشیان هەبێت، کەچی پەرلەمان لەو جۆرە دەوڵەتانەدا وەکو دەزگایەکی دەستەپاچە هیچ ڕۆڵێکی نییەو سەرکردەکانی ڕژێم هەرچەند بە ڕواڵەت هەڵبژاردنی درۆ دەست پێدەکەن، بەڵام لە واقیعدا هەموو کارێکیان ئارەزووکارییە.

**★پاسیفیسم - Pacifisme**

ئەم زاراوەیە لە وشەی لاتینی وەرگیراوە بەمانا صولحو ئاشتی دەگەیەنێت، دیسان بە لایەنگرانی صولحو ئاشتی دەوترێت. پاسیفیزم ڕێبازێکی شێوە لیبرالییە، ئەوانەی باوەڕیان بەم ڕێبازە هەیە دژی هەموو جۆرە جەنگێکن[1] وە لەو باوەڕەدان کە تەنیا بە قسەکردنو ڕاوێژکاری دەتوانن ئاشتی بچەسپێنن. لە سەردەمی ئێستای ئێمەدا کە سەردەمی کێشەی کۆمەڵانی خەڵكو ئیمپریالیزمە پاسیفیستەکان هەوڵی ئەوە دەدەن هەموو کێشەیەك بە ئاشتی ببڕێتەوەو تای مەسەلەکە بە لای قازانجی بەرەی ئیمپریالیزمدا بشکێتەوە. ئەمانە هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن شەڕ لە ڕووی ئیمپریالیزمدا نەکرێت.

---

1–مەبەست لە نووسینی سەردەمی کتێبەکەیە..

1–وە نەبێ لە ڕووی زانستییەوە جۆرەکانی جەنگ بەراورد بکەن–وەرگێڕ.

لایەنگری ئاشتی پێویستە ئازاو جەنگاوەر بێت، ریشەی ڕژێمی سەرمایەداریو سروشتی ئیمپریالیزم هەڵکەنێت.. شۆڕشگێڕ هەمیشە پشتگیریی لە شەڕی عادیلانەو شۆڕشگێڕانەی دژی ئیمپریالیزم دەکات.. پاسیفیزم بە یەك چاو سەیری دوو مەسەلەی دژ بە یەك وەکو "شەڕی عادیلانەوشەڕی ناعادیلانە" دەکات.

### ★پرۆلیتاریا - Proletariat

بە چینی کرێکار دەوترێت، واتە بەو کەسانە دەوترێت کە هیچ جۆرە هۆیەکی بەرهەمهێنانیان نییە، ناچارن هێزی کاری خۆیان بە خاوەن هۆیەکانی بەرهەمهێنان –واتە سەرمایەدارەکان– بفرۆشن..

کرێکاری سنعەتی دەقاودەق پرۆلیتاریا دەگرێتەوە، بەم پێیە مەفهوومی تایبەتیی ئەم وشەیە پەیوەندیی بە کۆمەڵگای سەرمایەدارییەوە هەیە، ئەگەرچی لە زۆر بواردا بە چینی کرێکار بە گشتی دەوترێت پرۆلیتار.

پرۆلیتاریا هۆشیارترین چینی شۆڕشگێڕە لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا، چونکە پرۆلیتاریا لەگەڵ پێشکەوتووترین یان نزمترین شێوەی بەرهەمهێناندا واتە چەرخی سنعەتیو بەرهەمهێنانی سنعەتیی گەورە پەیوەندیدارەو لەگەڵ ئەواندا گەشە دەکات.

پرۆلیتاریا لە بارەی ڕێکخستنو کاری هۆشیارانەوە لە چینەکانی تر لە پێشترو هۆشیارترە.. بەربەرەکانێی پرۆلیتاریا لە دژی بۆرجوازی ناوەرۆکی یاسای کۆمەڵگەی سەرمایەدارییە.

پرۆلیتاریا لە کاتی ڕاپەریندا بۆ خۆڕزگارکردن دەتوانێتو پێویستە هەموو کۆمەڵانی زەحمەتکێشو –بەتایبەتی جووتیاران– بۆ لای خۆی ڕابکێشێو ڕابەریی ئەو ڕاپەرینەی بکات لە دژی سەرمایەداران. هەروەها پرۆلیتار –چینی کرێکار– دەتوانێت پەیامی مێژوویی لەناوبردنی بۆرجوازیو بونیاتنانی کۆمەڵگەیەکی تازەی سۆشیالیستی بەجێ بگەیەنێت. لە باری سەرنجی مێژووییەوە چینی پرۆلیتاری سنعەتی لەگەڵ پەیدابوونی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، واتە لە قۆناغی لەناوچوونی فیودالیزمدا پەیدا دەبێت.. ماڵوێرانیو سەرگەردانیی جووتیارەکان کە زەوییوزارەکانیان لە دەست دەدەن، یەکەمین سەرچاوەی هاتنە کایەی پرۆلیتاریایە، دوای ئەوەش سەرگەردانیو تێکشکاندنی وردە بۆرجوازیی شارو لادێ لەگەڵ گەشەکردنی سەرمایەداریدا دەبێتە هۆی بەهێز بوونی ریزەکانی پرۆلیتاریا لە دوای شۆڕشی سۆشیالیستی و لەناوبردنی چەوساندنەوە, پرۆلیتاریا دەبێتە چینێکی تازە , چینێکی کرێکار کەسیستەمی سەرمایەداری لەناو بردووەو هۆیەکانی بەرهەمهێنان تێکڕا بوونەتە موڵکی سیستەمی سۆشیالیستی چارەنوسی خۆی ئەکەوێتە دەست خۆی .

### ★پروپاگەندە-ئاژیتاسیۆن - Propagande-Agitation

**پروپاگەندە:**

بڵاوکردنەوەی بیری سیاسییانەو فەلسەفیو مەفهومی ئەو شتەی کە پێویستە ڕابگەیەندرێت، بە زۆری لەناو کۆمەڵدا بڵاودەکرێنەوە، بەڵام قووڵترو هەمە لایەنانە ترە، شێوەی پروپاگەندە زۆر تر شێوەی شیکردنەوەی ئاقڵانەیە. هەموو ڕێکخراوو دەستەو کۆمەڵە سیاسییەکان سوود لە پروپاگەندەو ئاژیتاسیۆن وەردەگرن و بە چەندان جۆر خزمەتی مەبەستی خۆیانی پێدەکەن. ئەویش هەندێکیان بە قازانجی گەلو زەحمەتکێشانەو هەندێکیشیان بە قازانجی بەرەی دژ بە گەلە.

**ئاژیتاسیۆن(1)**

واتە هۆی کارتێکردنە خەڵك لە ڕێگای گفتوگۆو، قسەکردن، کۆبوونەوەو ئاهەنگ، ڕۆژنامە، کتێبو نووسراو، ڕادیۆ، سینەما، تەلەفزیۆنو.. زۆر جار کە بۆ هۆشیاریی خەڵکو شیکردنەوەی تیۆری لەناو خەڵکدا بەکاربێت ئەوەیە بە چالاکیی ناو دەبرێت. ئاژیتاسیۆن بە تایبەت لەناو جەماوەردا وەکو کارێکی سیاسیو ڕاگەیاندن دەوری کاریگەرێتیی خۆی دەنوێنێت. ئاشکرایە ئاژیتاسیۆن پەیوەندییەکی بەتینی بە ئەرکە سیاسییەکانی ڕێکخراوەکانەوە هەیە.

### ★تیرۆریزم-Terrorisme

بە مانا کێویو دڕندەیەتی دەگرێتەوە، تیرۆریست بە پیاو کوژو دەست وەشێن دەوترێت، واتە ئەو جۆرە کەسانەن کە لە پیاوکوشتنو کرداری خراپە هیچ کۆیەك ناکەنەوە.. هەڕەشە لە خەڵك دەکەنو ئەمونەو دەترسێنن، ترس دەنێنە دڵی خەڵکەوە، خەڵك دەڕفێننو دەیشارنەوە. یان لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجیاندا هەموو کارێکی ناڕەوا دەکەن.. ئەمە ئێستا وەکو بیروباوەڕی لێهاتووە لە جۆری بیرکردنەوەی فاشیستیو ماکیاڤیلییە.

---

1–هەرچەندە بە پێی ریزی پیتەکان جێگای ئاژیتاسیۆن لێرەدا نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی پەیوەندیی مەفهوومیان لەگەڵ پروپاگەندەدا هەیە لێرەدا دانرا– وەرگێڕ.

### ⋆تیۆری - Theorie

بریتیـیە لـە بلاوبوونـەوەی تاقـیکردنەوەو پراکتـیکی کۆمەلایـەتی، تـیۆری کۆمەڵە بیرکردنەوەیەکی ڕێ نیشاندەرانەیە لە زەمینەی زانسـتییەکانی ئادەمیزاددا، بریتییە لە ئاڕاستەکردنو ڕووتکردنەوەی زانستی یاساکانی گەشەکردن لە بواری سروشتو کۆمەڵدا. تیۆری کە لەسـەر بنچینەی پراکتـیکو کارکـردن پـەیدا دەبێـت ڕۆڵـێکی گـەورە لـە ژیانی کۆمەڵداو لە بواری زانستییەکانی ئادەمیزاددا دیاری دەکاتو ڕێگەی دوور بۆ چالاکیی ئادەمیزاد ڕوون دەکاتەوەو پراکتیك بەرەو پێش دەبات.

تـیۆری شۆڕشـگێڕانە ئـەوەمان فـێردەکات کـە بەلگـەی سـەرکەوتنی ئەرکەکانی کۆمەڵ بریتییە لە یەکێتیی نێوان تیۆریو پراکتیك نـێوان بیرکردنەوەو کارکردن، هـەر تیۆرییـەك ئەگەر لەگەڵ کاری شۆڕشگێڕانەدا لەگەڵ پراکتیکی گۆڕین بەخشدا یەکسان نەبێت ئەوا ئەهمیـیەتی نـاوەڕۆکی خـۆی دەدۆڕێنێت.. هەروەها پراکتیكو کارکردنیش ئەگەر بە چرای ڕێ نیشاندەرانەی تیۆری شۆڕشگێڕانە ڕوون نەکرێتەوە ئەوا کوێرو بێ بەرهەم دەمێنێتەوە.

ڕێکخـراوە شۆڕشـگێڕییەکان پایـەی چـالاکی خۆیـان لەسـەر یەکێتیی نێوان تیۆریو کارکردن –واتە تیۆرو پراکتیك– دادەمەزرێنن. تـیۆری شۆڕشگێڕانە کۆمەڵە بیرکردنەوەیەکی ڕێ نیشاندەرانەی چالاکیو کارکردنی ڕێکخراوە کرێکارییەکانە. ڕۆڵی کاریگەرانەی تیۆری شۆڕشـگێڕانە لـەوەدا بـە دیـار دەکەوێـت کـە زەمینەی زانستی بۆ ڕێکخراوە کرێکارییەکان خۆش بکات، بۆئەوەی لە هەر بارو دۆخێکدا ڕێگـای خۆیـان دەسـت نیشان بکـەن، ڕووداوەکـانی بـەردەم خۆی بە واقیع ببینێ. چالاکیی خۆی لەسەر پایەی زانستی دابمەزرێنێت، شـوێنکەوتنی دۆگماتـیکانەو دووبارەکـردنەوەی کـاری کوێـرانە "واتـە کوێـرانە شوێنکەوتن" بە هیچ جۆر لەگەڵ ڕێبازی شۆڕشگێڕانەدا ناگونجێتو هیچ ئەنجامێکی بە سوودی نابێت.

### ⋆تەکنۆکراسی - Technocracy

حکومەتـە خـاوەن تەکنیکەکان، جـۆرە حکومەتـێك کـە لەگـەڵ سـەردەمی پێشکەوتنی هونەریو زانستیدا بڕوات. لەو سەردەمەدا پێویسـتە هـەموو سەرچاوە ئابوورییەکانو تەواوی کاروباری کۆمەڵ لە لایەن کارزانو زانایانەوە بەڕێوە ببرێن. تەکنۆکراتەکان کۆمەڵێك بـوون کـە لـە دوای یەکـەمین شـەڕی جـیهانی دەسـتیان کـرد بـە لێکۆڵیـنەوە لـە ڕۆڵـی کاریگەرانـەی تەکنـیك لـە کۆمـەڵدا لـە وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا.

ئەمانـە لـەو بـاوەڕەدابوون کـە پێشکەوتنی باری تەکنیك، بە تایبەتی لە ئەمریکای ژووروو ئەو سیستەمە ئابوورییەی کە لە ئارادابوو لەسـەر بنچینەی مەکانـیزەی نرخو بەها دامەزرابوو لەناوی بردووە، لەبەر ئەوە کۆمەڵ لە سیستەمی نرخو بەهادا زۆرتر دووچاری قەرزو قۆڵـە دەبێـت. لـە ئـەنجامدا توانـای کـڕینو فرۆشـتن لە ئاستی پێشکەوتنی باری تەکنیك دوادەکەوێت. ئەم دواکەوتنە دۆخێکی نالەبار بەسەر باری نرخو بەهاو سەقامگیربوونی کۆمەڵدا دێنێت.

تەکـنۆکراتەکان پێشـنیاریان دەکرد کە ئینێرژیی بەرهەمهێنان سەنگی مەحەك بێتو لەگەڵ یاساکانی فیزیکدا بگونجێت، لەو کاتەدا دەوڵەت دەکەوێتە دەست کارزانە تەکنیکییەکانەوە.

### ⋆توتالیتریزم - Totaliterisme

*بەو ڕژێمانە دەوترێن کە ئەم خاسییەتانەیان تێدا بێت:*

دەوڵـەت چـاودێریی هـەموو کاروبـارێکی ئـابووریو کۆمەلایـەتی بکـات، دەسـەڵاتی سیاسـی بەدەسـت کۆمەڵـێکەوە بێـتو هـەموو شـێوەکانی دیموکـراتی ڕەت بکاتـەوە، (تەنانـەت لـەناو کۆمەڵەکـە خۆیشـیدا).. تـیرۆرو سـەرکوتکردنی هـەر کەسێك کە سەرپێچیی لە فەرمانـەکانی سـەرۆکی دەوڵـەت یـان کۆمـەڵ بکـات. هـەوڵدان کـە هـەموو کـەس بـاوەڕ بە دەسەڵاتی سەرکردایەتیی دەوڵەت بهێنێت. لەناوبـردنی سـەربەخۆیی تاکـە کەسی، چاودێریکردنی هەموو جۆرە چالاکییەکی ئەدەبیو هونەری، کۆکردنەوەی هەموو هێزی خەڵك لە پێناوی خزمەتکردنی دەوڵەتو دەسەلاتدا، ڕێگە نەدان بە هیچ کۆرو کۆمەڵێك کە بیانەوێت بیرو باوەڕو ئایدیۆلۆجیی خۆیان دەرببڕن.

دەوڵـەتـە توتالـیتریزمەکان زۆر جـار ڕاپـەڕیـنی دژی دیموکراتی دەخوڵقێـنن، کـە لـە سـەرەتاوە وەکو ڕێکخراوێك لەناو سیستمێکی دیموکراتیدا کۆدەبنەوە، دوای دەسەلات وەرگرتن دیموکراتی لەناو دەبەن.

دەرکەوتووترین نموونەی ئەمجۆرە ڕاپەڕینە حزبی ناسیۆناڵ سۆشیالیستی ئەڵەمان بوو کە هیتلەر ڕابەریی دەکرد، کە دوای ئەوەی دەسەلاتی گرتە دەست لە ڕێگەی دیموکراتی لایداو دیموکراتیی لە وڵاتدا لەناوبرد.

ئیتالـیای فاشیستو ئەڵەمانی نازی باشترین نموونەی دەوڵەتی توتالیتریزمن. زۆر جار هەندێك لە سیستەمە پێشکەوتووەکانیش بەم ناوەوە ناودەبرێن، بەلام جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ئەم دوو سیستەمەدا هەیە.

لـە سـەردەمی سـتالیندا لـە وڵاتـی سـۆڤێت کـرداری تیرۆریستیو حوکمی تاکەکەسی توندوتیژ بوو، بەلام نازیزمو فاشیزم لە ڕووی بونیاتنانی فیکریو ئایدیۆلۆجییەوە دژی دیموکراتین.

### ⋆تابوری پێنجەم - FifthCampaign

بە مانا خیانەتی شاراوە، کە خزمەتی بەرەی دوژمن ئەکەن.. لە ڕووی فیکریو ئایدۆیۆلۆجییەوە دژی دیموکراتین.

لە پشتی گەلەوە کرداری خراپەکارانە ئەکەن، ئەم زاراوەیە بۆ یەکەمجار لە سەردەمی شەڕە ناوخۆییەکانی ئەسپانیادا لە ساڵەکانی (١٩٣٦-١٩٣٩) بەکارهێنراوە، لەو کاتەدا کۆنەپەرستانی ناوخۆ بە سەرکردایەتی جەنەڕاڵ "فرانکۆ"[1] چوون بەکۆمەکی فاشیستەکانی ئەڵمانیاو ئیتالیاوە لە دژی خەڵکی ئەسپانیاو کۆماری تازە دەجەنگان.

جەنەڕاڵمولا[2] کە یەکێکبوو لە سەرکردەکانی سوپای فرانکۆ سەرکردەیی چوار لەشکری لە ئەستۆدا بوو، ڕوویکردە "مەدرید" بۆ ئەوەی کۆماریخوازەکان تێك بشکێنێت، مولا.. لەو کاتەدا وتی: من تابورێکی ترم لە ناو خەڵکی مەدریددا هەیە کە تابووری پێنجەمی لەشکرەکەمانە، مەبەستی لەو خایەنانەی ناو خەڵکی مەدرید بوو کە بە دزییەوە خزمەتی دوژمنیان دەکردو دژی زەحمەتکێشە شۆڕشگێڕەکان خراپەکارییان دەکرد.. لەو کاتەوە زاراوەی "تابوری پێنجەم" بۆ ئەو خایانانە دانراوە کە بە دزییەوە لەناو خەڵکدا یان ڕێکخراوەکاندا خزمەتی دوژمنو بێگانە ئەکەن.

### ★تیمۆکراسی - Timocracy

ئەفلاتون ئەم زاراوەیەی لە کتێبی کۆماری خۆیدا لە بارەی دەوڵەتەوە ناو بردووەو بە کاری هێناوە، واتە ئەو دەوڵەتانەیە کە سەرکردەکانیان تەنیا لە پێناوی ڕێزو شانازیدا کارئەکەن، نەك لەسەر بنچینەی دادپەروەریو یاسا و لەپێناوی شتیتردا.

### ★جیۆ پلیتیك - Geopolitique

ئەم زاراوەیە لە دوو وشە پێکهاتووە "جیۆ" کە بە مانای زەوی، وە "پلیتیك" بە مانا سیاسەت دەگرێتەوە. ئەمە بریتییە لە تیۆرییەکی کۆنەپەرستانە کە هەوڵدەدات سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە ئیمپریالیستەکان بەهۆی عونسوری جوگرافیاییەوە ڕوون بکاتەوە.

ئامانجی سەرەکیی ئەم ڕێبازە داگیرکردنی خاکی بێگانەو کۆیلەو ژێردەستە کردنی خەڵکە، بۆ نموونە هیتلەرییە فاشیستەکان دەیانویست ئەوە بسەلمێنن کە ئەڵمان پێویستیی بە ژیانەو جەنگ لەپێناوی داگیرکردنی خاکی وڵاتانی دراوسێو ژێردەستەکردنی خەڵکدا کارێکی ڕەوای ئەڵمانیایە.. ئێستاش دەستدرێژکارە ئیسرائیلییەکان بە پشتیوانیی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا خاکی عەرەبیان داگرکردووەو لەم ڕووەوە ئەم تیۆرییە بەکاردێنن.. هەروەها ڕێبازو تیۆریی "نیاخاك" یان ئێرانیستەکان[1] لەم سەرچاوەیە ئاودەخۆنەوە.

### ★جەنگ - War

جەنگ واتە ڕاپەڕینی چەکدارانە لە نێوان وڵاتەکاندا یان لە نێوان چینەکانی کۆمەڵدا کە لە پێناو چەند ئامانجێکی سیاسیو ئابووریدا ڕوو دەدات.. جەنگ، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی مێژووییە، واتە لە قۆناغێکی تایبەتی مێژوویی کۆمەڵگای ئادەمیزاددا دەست پێئەکاتوپەیوەندی بە هەلومەرجی ژیانی کۆمەڵەوەیەو لە قۆناغێکی تری مێژوویی کۆمەڵدا تەواو ئەبێت.

لە ڕووی مێژووییەوە پێویستیی یەکەمین دەستەی چەکداری لەشکر لەگەڵ پەیدابوونی موڵکدارێتیی تاکە کەسو پەیدابوونی چینەکانو دەوڵەت پەیدا بووە. لەو کاتەوە لە کۆمەڵگای چینایەتیدا جەنگ بە شێوەی گشتی بووە بە هۆی چەسپاندنی حوکمی چینە داگیرکارەکان و داگیرکردنی زەوی وزار و خەڵك گرتنە ژێردەست .لەسەردەمی ئێستادا سەرچاوەی بنچینەیی هەموو جەنگێك ڕژێمی سەرمایەداری و ناکۆکیەکانیەتی کەلە قۆناغی ئیمپریالیزمدا دەگاتە ئەو پەڕی توندو تیژیی خۆی، تیۆری شۆڕشگێڕانە لە بارەی جەنگەوە ئەوە نیشان دەدات کە دوو جۆر جەنگ هەیە، وەکو: جەنگی عادیلانەو جەنگی ناعادیلانە..

***جەنگی عادیلانە:***

ئەو جەنگەیە کە لەبەر داگیرکردنی خاکی ئەمو ئەوو هێنانە ژێردەستی خەڵکەوە ڕوونادات، بەڵکو جەنگێکی ئازادیخوازانەیەو لە پێناوی داکۆکی لەسەر نیشتمانو دەستکەوتەکانی زەحمەتکێشاندا ڕوو دەدات. لە دژی ئیستیعمارو داگیرکاران، دەست درێژکارانی بێگانە، دژی کۆیلەیەتیو هەموو جۆرە ستەمێك بەرپا ئەبێت.

***جەنگی ناعادیلانە:***

جەنگێکی سنوور شکێنە لە پێناوی ژێردەستەکردنی نەتەوەکانی ترو سەرکوتکردنی زەحمەتکێشانو فراوانبوونی دەسەڵاتی داگیرکارانە بەرپائەبێت. بۆ نموونە: وەکو جەنگی ڤێتنام، کە لە لایەکەوە هێزی ئیمپریالیستە ئەمریکاییەکانو نۆکەرو داروودەستەکانیان ولەلایەکی تریشەوە خەڵکی ڤێتنام ڕوو بە ڕووی یەك دەجەنگان.

ئەو جەنگەی ئەمریکا هەڵی دەگیرساند جەنگێکی سنوور شکێنو دیلێتی خوازبوو، ئەو جەنگەش خەڵکی ڤێتنام دەیانکرد جەنگێکی عادیلانە بوو، لە پێناوی بەدەست هێنانی سەربەخۆییو ئازادیو یەکێتیی گەل بوو. ئەوەبوو لە ئەنجامدا ئەو جەنگە بوو بە جەنگێکی ڕەوای تەواوی خەڵکەکانی هیندو چین. لەبەر ئەوەیە کە هەر کەسێکی بە شەرەفو نیشتمان پەروەر بەرپەرچی هەموو دەست درێژییەکی ئەمریکا دەداتەوە کە ئەیەوێت ڕژێمی ئیستیعماریی ئازادیکوژی خۆی سەقامگیر بکات.

تیۆری شۆڕشگێڕانە هەمیشە بەرهەڵستیی هەموو جۆرە جەنگێکی ناعادیلانەو دەست درێژکارانە دەوەستێو داکۆکی لەسەر جەنگی عادیلانەی کۆمەڵانی خەڵك ئەکات.

---

١-FranKo

٢-Mola

١-حزبێکی کۆنەپەرستانەبوو لە ئێراندا-وەرگێڕ.

یەکێك لە جۆرەکانی جەنگی عادیلانە جەنگی پارتیزانیی خەڵکە، کە بریتییە لە جەنگی چەند دەستە چەکدارێکی ناڕێك‌و پێکی خەڵك لە پشت بەرەکەی جەنگی دوژمنەوە.. لە ناوەڕاستی ئەو ناوچانەی کە داگیرکراون. جەنگێکە کۆمەڵانی خەڵك بە چەندان جۆرە بەرامبەر بە دوژمن دەینوێنن. وەکو جەنگی پارتیزانی خەڵکی ئەسپانیا دژی فەرەنسییە داگیرکارەکان لە سەردەمی ناپلیۆندا، زیاتر لە سەدەو نیوێك لەمەوبەر[1].. جەنگی خەڵکی ڕوسیە لە سەردەمی پەلامارەکەی ناپلیۆندا هەر لە هەمان کاتدا. جەنگی نیشتمان پەروەرە ئیتالیاییەکان بە سەرکردەیی "گاریباڵدی"، ئەویش سەدەو نیوێك لەمەوبەر[2].

جەنگی فەرەنسییەکان لە دژی ئەڵەمانییە داگیرکارەکان نزیکەی سەدەیەك لەمەوبەر[3]، کە بە شێوەیەك لە شێوەکانی جەنگی پارتیزانی ناو دەبرێت. هەر وەکو جەنگی دەستەو کۆمەڵی چەکدارە پارتیزانەکانی ڕوسیا لە کاتی جەنگی ناوخۆیی‌و دووەمین جەنگی جیهانیدا.

هەروەها لە ماوەی دووەمین جەنگی جیهانیدا لە فەرەنسەو ئیتالیاو یوگۆسلاڤیاو پۆڵەندەو بولگاریاو چیکۆسلۆڤاکیاو یۆنان‌و چین‌و ڤێتنام‌و فیلیپین‌و چەندان شوێنی تری بەمجۆرە.

لەم باسەدا مەفهوومی مەسەلەی جەنگ مەبەستێکی تری تێدایە ئەویش شەڕکردنە لە پێناوی ئاشتیداو ڕێگرتن لە شەڕی دەست درێژیکارانەی ئیمپریالیستی.. ئەوەمان وت کە سەرچاوەی بنچینەیی جەنگ ڕژێمی سەرمایەدارییە، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە تاکو ئەو کاتەی سیستمی سۆشیالیستی لە هەموو وڵاتەکاندا دەچەسپێت توانای بەرگریکردن لە جەنگ نابێت‌و ئیتر لەبەردەم هەڵوێستێکی درندەی جیهانیدا دەستە پاچە دابنیشین، ئێستا ئەوەندە هێزی کۆمەڵایەتیی نیشتمانی لە ئارادایە کە توانای ئەوەیان هەیە بتوانن ڕێگای جەنگی ئیمپریالیستانە لە بەرەی ئیمپریالیزم بگرن.

لە کۆبونەوەی ڕاوێژکاریی ستراتیجی ئەم ڕێکخراوانە لە بارەی جەنگەوە بەم جۆرە دیاریکراوە" تەنانەت لە سەردەمی ئێستاشدا ئەو هێزانەی کە توانای ئەوەیان هەبێت کۆمەڵگای ئادەمیزاد لە مەترسی جەنگێکی جیهانی تازە ڕزگاربکەن سێ هێزی گەورەی کۆمەڵایەتین وەکو: _سیستمی سۆشیالیستی جیهان، ڕاپەڕینی نیشتمانییانەی دژ بە ئیمپریالیزم، ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەی کرێکاران لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا._

ئێستاش ناوەڕۆکی دەست درێژکارانەی ئیمپریالیزم شێوەیەکی سامناکی تازەی بە خۆوە گرتووە، لەم هەلومەرجەدا بە گەلێك شێواز باسی بەرگریکردن لە جەنگی دەستدرێژکارانەی ئیمپریالیزم کراوە. هەندێك دەڵێن جەنگێکی جیهانیی سەرتاپاگیر کارێکی حەتمییەو ڕەتکردنەوەی نییەو کەس بەرگریی بۆ لێ ناکرێت. ئەمە ڕاکردنە لە مەسەلەکە.. هەندێکیش لەو باوەڕەدان کە بە هۆی چەکی مۆدێرنی هەمەجۆرو سامناکەوە ئەو جەنگەی چاوەڕوانی دەکرێت ڕوونادات. ئەمەش دیسان بیرکردنەوەیەکی نا واقعیانەیە.. ئەرکی سەرشانی ئێستامان ئەوەیە هەموو ئەو شێوانەی بەرهەڵستیی ئەم مەترسییە ئەکەن بەکار بهێنرێن، لەم کاتەدا کە ئیمپریالیزم هەوڵی ئەوە دەدات لاوازیی خۆی بەمکارە دەستدرێژکارانەیە بەهێز بکات.

یەکێك لە شێوەکانی ئەمڕۆی ئیمپریالیزم ئەوەیە جەنگێکی سەرتاپاگیر لە دەرەوەو ناوخۆدا هەڵبگیرسێنێت، لەم جەنگەشدا مەبەستی ئیمپریالیزم ئەوەیە دەست لە سەنگەری سۆشیالیزم‌و ڕاپەڕینی ئازادیخوازانەی نیشتمانی بوەشێنێت. . ئەم شێوەیە بە ئاشکرا لە ڕواڵەتی مانۆڕەکانیدا دەردەکەوێت. ئەم مانۆڕانە هەندێکجار بە پێی دەستووری تایبەتیی ئیمپریالیزم ڕوودەدەن، وەکو دەستدرێژکاریی ئیسرائیل، یان لە ڕێگەی پیلان‌و کودەتاوە، هەروەکو کودەتای ئەفسەرە یۆنانییەکان، وەیان لە ڕێگەی جموجووڵی هوشیارانەوە دژی وڵاتە سۆشیالیستییەکان، وەکو ڕووداوی کەشتییە جاسووسییەکەی ئەمەریکا–پوینلو–..، لەم کاتو هەلو مەرجانەدا ئەرکی سەرەکی مێژوویی سەرشانی هەموو بریتییە لە کوێرکردنەوەو پووچەڵکردنەوەی نەخشە دەستدرێژکارانەکانی ئیمپریالیزم، بەر لەوەی کار بگاتە ڕادەی جەنگ.

_ئەم ئەرکەش دەکەوێتە ئەستۆی هاریکاری دەستەجەمعی هەر سێ هێزە ئازادیخوازە دژ بە ئیمپریالیزمەکە، واتە "سیستەمی سۆشیالیستیی جیهانی، ڕاپەڕینی ئازادیخوازانەی گەل‌و ڕاپەڕینی کرێکارانی وڵاتە سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکان"..._

_لەبەر ئەمە هەوڵدان بۆ پووچەڵکردنەوەی نەخشە جەنگخوازییەکانی ئیمپریالیزم گرنگترین مەسەلەی سیاسیی ئەمڕۆو ئەرکی سەرشانی ئەو سێ دەستەیەیە._

سەرکەوتنی ئەم ستراتیجە، واتە سەپاندنی شێوەی ژیانی پێکەوە بەئاشتی ژیان بەسەر وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا کە شێوەیەکە لە خەباتی چینایەتیانە بە ئاقازانجی هەر سێ لایەکەیە، چونکە زەمینەیان زیاتر بۆ خۆش ئەبێت کە زیاتر گەشە بکەن‌و زیاتر سیستمی پێشکەوتووانە بچەسپێت‌و زیاتر یارمەتی نەتەوەکانی جیهان بدرێت.

ئەمکارە بە سوودی ئازادیخوازانەی گەلییە، چونکە بە ئاشتی پێکەوە ژیان ڕیزی دەسەڵاتی نەتەوەکان زیاد ئەکات‌و ڕاپەڕینی عادیلانەی نەتەوەکان لە پێناوی سەربەخۆیی‌و ئازادیدا سەر دەخات. بە قازانجی زەحمەتکێشانی وڵاتە سەرمایەدارییەکانە، چونکە ئەم خەڵکانە نابنە قوربانی کارێك کە بە هیچ جۆر لەگەڵ ئاواتیاندا ناگونجێت‌و دووچاری مەینەتی ئاڵۆزی مادی‌و مەعنەوی نابن.

(١و٢)–مەبەست سەردەمی نووسینی کتێبەکەیە–وەرگێر.
٣–لە کاتی نووسینی کتێبەکەوە.

**جەنگی سارد:**

ئەم زاراوەیە باری توندو تیژی نێوان نەتەوەکان یان نێوان وڵاتە سۆشیالیستییەکانو وڵاتە سەرمایەدارییەکان دەردەبڕێت.. ئەم زاراوەیە بە گشتی لە دوای دووەمین جەنگی جیهانی پەیدا بووە، لە کاتێکدا کە دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکان ڕەوشتی دەستدرێژکارانەو خراپەکاریی خۆیان دەنواندو بەرگرییان لە هەموو جۆرە پەیوەندییەکی دۆستانەی نێودەوڵەتەکان دەکردو مشتومڕیان لە نێوانیاندا دەنایەوەو دەیانکردن بەگژ دەوڵەتە سۆشیالیستییەکاندا.

دەست تێوەردانی ئیستیعمار یانەیان لە دژی ڕاپەڕینی نەتەوە ئازادیخوازەکان دەست پێکرد، باری ناوخۆی دەوڵەتەکان توندو تیژ دەبوو بێ ئەوەی شەڕێکی دەستەو یەخەیی لە نێوانیاندا هەبایە، پەیوەندیی نێوانیان تاریکتر دەبوو. هەزاران جۆر جموجووڵو لێك سڵەمینەوەو دوودڵی بە پێچەوانەی سەردەمی ئاشتییەوە لە نێو وڵاتاندا دەخولقا.. وڵاتە ئیمپریالیستییەکان لە پێناوی ئامانجی ئیستیعمار گەرانەی خۆیانداو مەحکەمکردنی دەسەڵاتیان پەنا ئەبەنە بەر جەنگی سارد.

شێوازی جەنگی سارد، لە دوای دووەمین جەنگی جیهانییەوە یەکەمین جار وینستۆن چەرچڵ لە "فولتن" باسی کردووە. ئیمپریالیستی ئەمەریکا کردی بە سیاسەتی ڕەسمیی خۆی. مەبەست لە سیاسەتی ئاشتیخوازانەو بە ئاشتی پێکەوە ژیان کە دەوڵەتە نیشتمانییەکان لە سەری دەڕۆن بە زۆری مەبەست کۆتاییهێنانە بە جەنگی سارد، چونکە جەنگی سارد گەلێك گیروگرفت دەخاتە ڕێی گەشەکردنی خەڵكو ڕزگاریی گەلانەوە.

سیاسەتی جەنگی سارد، زیاد لە ڕابوردوو دووچاری ناکامی ئەبێتو ئەبێتە هۆی تاك خستنی ئیمپریالیستی ئەمریکا، تێکشکاندنی یەکجارەکیی سیاسەتی جەنگی سارد ئەبێتە هۆی سەرکەوتنی ئاشتیو پێکەوە بە ئاشتی ژیانی هەموو گەلان.

**جیهانبینی - Prospects**

بریتییە لە سیستمی تیۆرییەکان، تێگەیشتن لە بارەی جیهانەوە، ئەم زاراوەیە هەموو تیۆرییەکانی ئادەمیزاد لە بارەی جیهانەوە دەگرێتەوە. هەر لە تیۆری بیروباوەڕو فەلسەفیو کۆمەڵایەتیو سیاسییەوە تا ڕەوشتیو هونەریو ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە زانستی سروشتەوە هەیەو..، بە مەفهوومێکی ئاشکراتر زاراوەی جیهانبینیو ناوەرۆکی بریتییە لە تیۆری بیروباوەڕو فەلسەفی.. گرنگترین مەسەلەی جیهان بینی هەمان مەسەلەی بنچینەیی فەلسەفەیە. ئەتوانین هەموو جیهان بینییەکان بکەین بە دوو بەشەوە:

*١–ماتەریالیستی.*

*٢–ئایدیالیستی.*

جیهان بینی، تیشکدانەوەی ناخی کۆمەڵەو پەیوەندیی بە ئاستی زانستیو هوشیاریی ئادەمیزادەوە هەیە لە هەر قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوودا هەر وەکو پەیوەندە بە ڕژێمی کۆمەڵایەتیشەوە.

لە کۆمەڵگەی چینایەتیدا، جیهان بینی ماهییەتێکی چینایەتییانەی هەیە، ئاشکرایە جیهان بینیی چینی فەرمانڕەوا لە هەر کۆمەڵگەیەکدا بێت جیهان بینیی چینی دەسەڵاتدارە.. جیهان بینیی ئەهمییەتێکی زۆر بەکارکردن دەدات، چونکە پەیوەندییەکانی ئادەمیزاد بە جیهانو سروشتو کۆمەڵەوە دەدۆزێتەوەو یەکیان دەخاتو یارمەتیی گەشەکردنو پێشکەوتنی قازانجی پێشکەوتنخوازەکان دەدات.

جیهان بینیی نازانستیانەو کۆنەپەرستانەش خزمەتی چینو هێزە دەسەڵاتدارە داسەپیوەکان ئەکات. ڕێگە لە گەشەکردنی کۆمەڵ دەگرێت.. داکۆکی لەسەر چینە چەوسێنەرەکان ئەکات، بەرهەڵستیی ڕاپەڕینی زەحمەتکێشان دەوەستێ.

جیهان بینیی شۆڕشگێڕانە، بە شێوەیەکی فراوان جیهان بینییەکی زانستییانەی تەواوە، ئەم جیهان بینییە زانستیانەیە قازانجی پرۆلیتاریاو هەموو زەحمەتکێشان دەپارێزێت. لەگەڵ یاساکانی گەشەکردنی کۆمەڵدا دەگونجێت.. لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا ئەبێتە جیهان بینیی تەواوی خەڵك. ڕاستیو زانستێتیی جیهان بینیی شۆڕشگێڕانە هەموو مێژووی کارکردنی ئادەمیزاد، ژیان، هەموو دەستکەوتەکانو زانیاریی مرۆڤ دەسەلمێنێت.

***چین ÉÐÈØ Class**

*تیۆریی زانەکان بەمجۆرە باسی چینەکانی کۆمەڵیان کردووە:*

*"چین بەو کۆمەڵە خەڵکانە دەڵێن کە لە چەندان ئەندام پێکهاتوون، هەر یەکە بە پێی جێگەو شوێنی خۆی لە سیستمی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیو ڕۆژگاری مێژوویی دیاریکراوو بە پێی پەیوەندیی خۆی لەگەڵ هۆیەکانی بەرهەمهێناندا بە پێی ڕێگەی هێنانە دەستو کێشی دەستکەوتی لە بواری سامانی کۆمەڵایەتیدا، هەر یەکەیان لە وانی تر جیایە.*

*چینەکانی کۆمەڵ، ئەو کۆمەڵە خەڵکانەن کە هەندێکیان بەهۆی پلەو پایەی دیاریکراویانەوە لە بواری ئابووریو کۆمەڵایەتیدا ئەتوانن دەست بەسەر کاری کۆمەڵەکانی تردا بگرن".*

بە پێی ئەم لێکدانەوەیە جیا کردنەوەی چینەکان لە یەکتر بە شێوەی گشتی بە پێی پلەو پایەیان لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیدا دیاری دەکرێت.. جۆری پەیوەندیی چینەکان لەگەڵ هۆیەکانی بەرهەمهێناندا گرنگترین هۆی دیاریکردنی ڕاژەی چینەکانە لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیانەدا.

خاوەن هۆیەکانی بەرهەمهێنانو ئەو زەحمەتکێشانەی کە هۆی بەرهەمهێنانیان نییە هەر یەکەیان شوێنو پلەیەکی جیاواز لە یەکتریان هەیە لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیدا. یەکێکیان فەرمانڕەوایە، ئەویتریان بەردەستە. یەکێك ڕەنجدەرو ئەویتریش ڕەنجەکە دەبات..

چینەکانی کۆمەڵ دیسان بە پێی چۆنێتیو باری دەستکەوتی خۆیانەوە لە بەرهەمی کۆمەڵایەتیدا لە یەکتر جیا دەکرێنەوە. بۆ نموونە لە جیهانی سەرمایەداریدا، سەرمایەدارەکان سوود وەردەگرنو کرێکارەکان لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیدا ڕەنج ئەدەن. بەو جۆرە جیاوازییەکی ئاشکراو گەورە لە نێوان ئەو دوو چینەدا هەیە.

بەم جۆرە بە ئاشکرا دیارە کە تیۆریی شۆڕشگێڕانە چینەکانی کۆمەڵو بنچینەی دابەشکردنی کۆمەڵ بە چەندان چینی جۆر بەجۆر لەناو سنووری بەرهەمهێنانی ماددیدا دیاری ئەکات.

بەو جۆرەی کە مێژوو نیشانی داوە لە سەرەتای پەیدابوونی ئادەمیزاددا چینایەتی نەبووە، کۆمەڵگەی سۆشیالیستی یان کۆمۆنی سەرەتایی کۆمەڵگەیەکی بێ چینایەتی بووە، پەیوەندیی هەموو کەسێك لەگەڵ هۆیە سەرەتاییەکانی بەرهەمهێناندا وەکو یەك بووە.. ئاستی بەرهەمهێنان ئەوەندە نزم بووە کە تەنیا خۆراکی ڕۆژانەیان بەدەست دەهێناو توانای پاشەکەوتو خاوەن موڵکداریێتیی تایبەتیو یەکتر ژێردەستە کردن، بە هۆی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانەوە نەبووە.

لەگەڵ گەشەکردنو زۆربوونی هێزەکانی بەرهەمهێنانو بەرهەمهێنانی زیاد لە پێویستی ڕۆژانەو پاشەکەوتو دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتیو پەیدابوونی موڵکداریێتیی تایبەتیو لەناوچوونی موڵکداریێتیی سۆشیالیستی کێشی ئابووریی خەڵك زیادو کەمی کرد.

هەندێك، بە تایبەتی ئەوانەی کە سەرەك هۆزەکان بوون دەوڵەمەند بوونو بوونە خاوەن هۆیەکانی بەرهەمهێنان.. هەندێکیش لەوە بێبەشبوون ناچاربوون کار بۆ خاوەنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان بکەن، ئەم جیاکردنەوەی توێژە کۆمەڵایەتیانە لە یەکترو گەشەکردنیان بوو بە هۆی پەیدابوونی کۆمەڵگەی کۆیلەیەیی.

هەریەك لە فرماسیۆنە کۆمەڵایەتیو چینایەتییەکان خاوەنی ڕەوشتی چینایەتیانەی تایبەتیی خۆیەتی، لە کۆمەڵگەی کۆیلەییدا چینە سەرەکییەکان بریتی بوون لە کۆیلەکانو خاوەن کۆیلەکان، لە کۆمەڵگەی فیوداڵیدا بریتی بوون لە خاوەن موڵكو جووتیارەکان، لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا بریتییە لە پرۆلیتاریاو بۆرجوازییەکان، لە هەریەك لەم سەردەمانەدا جگە لە پرۆلیتاریاو بۆرجوازییەکان، لە هەر یەك لەم سەردەمانەدا جگە لەو چینە بنچینەییانەی ناومان بردن دیسان چینی لەمانە بچووکتریش هەیە، ئەوانە لەگەڵ چینە تازەکاندا لە حاڵەتی گەشەکردندانو لەگەڵ ئەو چینانەشدا کە لە حاڵەتی تواندنەوەدان دوور دەکەونەوە، بەڵام چینی کرێکار ڕۆڵێکی گەورە لە کۆمەڵدا دەگێڕێو خاوەنی پەیامێکی مێژوویی تایبەتییە، چونکە لە پێناوی سەقامگیربوونی سۆشیالیزمدا تێدەکۆشێو هەوڵی ئەوە دەدات کۆمەڵگەیەکی بێ چینایەتی دابمەزرێت.

کەواتوو چین (طبقة) دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی مێژووییە لە سەرەتاوە لە سەردەمی کۆمۆنی سەرەتاییدا نەبووە، لە سەردەمی کۆمۆنیزمیشدا دیسان لەناو دەچێت.

بە پێی باری سەرنجی مەفهوومی زانستیانەی چین کە وەکو لە سەرەوە باسمان کرد ئەو زاراوە تایبەتیانەی لە بارەی چینەکانەوە لە ڕۆژنامەو چاپەمەنییەکاندا بەرچاومان دەکەوێت وەکو چینی ڕۆشنبیرانو کرێکارانو ئافرەتانو سنعەتکارە دەستییەکانو ئەمجۆرە شتانە شتێکی ڕاست نییە، چونکە ئەمانە هەر یەکە توێژێکی تایبەتیی کۆمەڵ یان جنسێکی تایبەتینو تێکەڵکردنیان لەگەڵ یەکترو بە ناوی چینەوە پێچەوانەی باری سەرنجی شۆڕشگێڕانەیە. هەرچەندە ئەمانە قازانجیان هاوبەش بێتو هەر توێژەی لە چەندان ئەندامی کۆمەڵ پێکهاتبێت.

### ⋆حزب - Party

*"چەند زاراوەیەك لە بارەی ئۆرگانەکانی حزبەوە":*

بریتییە لە ڕێکخراوێکی سیاسی کەهاوبیرانو لایەنگرانی ئەو ڕێبازە سیاسییە لەسەر ئارەزووی خۆیان یەکیان تیا گرتووەتەوە، بە گشتی هۆشیارترین عونسوری چینێك یان توێژە کۆمەڵایەتییەکان کە قازانجیان یەك دەگرێتەوە تیا کۆدەبنەوە.

حزب داکۆکیی لەسەر قازانجی ئەو کۆمەڵانە ئەکاتو ڕابەرییان ئەکات.. لە کاتی گەشەکردنی سەرمایەداریدا چەندان ڕێکخراوی سیاسیی پرۆلیتاریاو بۆرجوازی کە دوو چینی سەرەکیی کۆمەڵگەی سەرمایەدارینو چەندان ڕێکخراوی سیاسیی چینەکانی کۆمەڵ پێکدێن. هۆی بنچینەیی زۆری حزبی بۆرجوازی لە هەندێك لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا ئەوەیە ئەو کۆمەڵگەیە چەندان چینو توێژی تیادایەو لە پێناوی بە دەستهێنانی حوکمدا بەربەرەکانێی یەکتر ئەکەن.

جگە لەوەش بۆرجوازی سوود لە بوونی زۆریی حزب وەردەگرێتو کۆمەڵانی خەڵك بە ڕوخساری جیاجیا هەڵ دەخەڵەتێنێت، بۆ ئەوەی لەسەر ڕێگەی ڕاستی خەباتی چینایەتیی خۆیان لایان بدات.. لە قۆناغی ئیمپریالیزمدا دەزگا ئینحیسارییەکانو هاوکارەکانیان بەرامبەر بە ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵك پەنا ئەبەنە بەر حوکمی دیکتاتۆرییانەو کوشتنو بڕینو تۆقاندن. چەندان حزبی فاشیست[1] بۆ مەبەستی خۆیان دادەمەزرێنن، چونکە حزبە فاشیستەکان لە واقیعدا داردەستو هێزی دەست وەشێنەری سەرمایەدارین.

---

١–وەکو حزبی "نازی" لە ئەڵەمانیای هیتلەریدا–وەرگێڕ.

بۆرجوازی لە ڕێگەی ئاریستۆکراسیی کرێکارانەوە هەوڵ دەدات ڕێکخراوی ڕیفۆرمیستی بۆ کرێکاران دابمەزرێنێتو بیانخەڵەتێنێت.. ڕێکخراوی پرۆلیتاری، ڕێکخراوی سیاسیی شۆڕشگێڕانە ئەمانە قازانجی کۆمەڵانی خەڵك دەپارێزن.. تەنیا ڕێکخراوە شۆڕشگێڕییەکان ئەتوانن ڕابەری ڕاستەقینەی ڕاپەڕینی چینی زەحمەتکێشان بگرنە ئەستۆی خۆیانو ڕابەرییان بکەن.

لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا، کاتێك شۆڕشی گەلان وەکو ئەرکێکی عەمەلی دێتە کایەوە لەو کاتەدا ڕێکخراوە شۆڕشگێڕییەکان ڕۆڵێکی گرنگ دیاریی ئەکەن.

### ★خود موختاری - Self-Determination

بریتییە لە سەربەخۆیی سیاسیی نەتەوەکانو دوور بوونیان لە ژێردەستەیی دەرەوە، لەم سەردەمەدا سەربەخۆیی یان خودموختاریی کەمایەتییەکانو ناوچە ژێردەستییەکانو پاراستنی دەوڵەتە بچووکە لاوازەکان ئەرکی سەرشانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە.

یاسای خود موختاریی نەتەوەکان لەگەڵ ڕاپەڕینی سەربەخۆیی خوازانەی نەتەوەکانی ئەوروپادا لە سەدەی نۆزدەیەمدا گەشەی کردو بڵاوبووەوە.. بە پێی ئەم یاسایە هەموو نەتەوەیەك مافی ئەوەی هەیە کە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ خۆی پێکبهێنێتو خۆی حکومەتی خۆی هەڵبژێرێت.. بڵاو بوونەوەی بیری ناسیونالیستییانە لە ئەوروپاوکارتێکردنی بۆ کیشوەرەکانی تر گەلێك ڕاپەڕینی نەتەوایەتییانەی لە وڵاتەکانی تری جیهاندا خوڵقاندو یاسای خودموختاریی نەتەوەیی کرد بە شێوەی یاسایەکی بنچینەیی لە بواری پەیوەندیی نێونەتەوەکاندا.

گیروگرفتی هەرە گەورەی خودموختاری لەوەدایە کە ئایا ئەو نەتەوەیە، یان ئەو کۆمەڵە خەڵکە مافی خودموختارییان هەیە یان نە؟ نووسراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ناوی ئەو نەتەوانەیان دەستنیشان نەکردووە کە مافی خود موختارییان هەیە، بەڵکو چارەنووسی هەر نەتەوەیەك بەستراوە بە بوونو واقیعی خۆیەوە، بەڵام بە شێوەی گشتی ئەو نەتەوانەی کە بە ئاشکرا هێڵێکی دیار لە نێوان ئەوانو نەتەوەیەکی تردا، یان دەوڵەتێکدا هەیە، ئەوە مافی خود موختارییان هەیە.

ئێستا دەوڵەتە گەورەکان پەلاماری زۆر شوێنو نەتەوە ئەدەنو گەمارۆی عەسکەرییان ئەدەن بەو بیانووە گوایە داکۆکی لەسەر قەوارەی سیاسیو خودموختارییان ئەکەن.

خود موختاری زۆر جار بە مانای سەربەخۆیی دیاریکراوی نەتەوەیی وەکو (Autonomy) بۆ کەمایەتییە ئاینیو نەژادییەکانی نێو وڵاتێك یان گەلێك لە نێو وڵاتێکی گەورە یان ئیمپراتۆرییەتێکدا بەکار هێنراوە.

### ★دیسپۆتیزم - Despotisme

بەو دەسەڵاتە دەوترێت کە هیچ سنوورێکی یاسایو نەرێتی نەبێتو خۆی سەرپشکی هەموو کاروبارێکی سیاسیو ئابووریو عەسکەریو ئیداریو دارایی بێت.. دیسپۆتیزم بە گشتی مانای خراپو هاوشانیی ستەمی هەیە، بەڵام هەندێك جاریش باسی "دیسپۆتیزمی ڕۆشنبیرانە" دەکرێت کە مەبەست لەو جۆرە حکومەتە ئایدیالیستیانەیە کە ئەفلاتوونو هەندێك لە ڕۆشنبیرەکانی دەورو بەری داوایان دەکرد.

فیتفوگل[1] کۆمەڵناسی ئەڵمانی مەفهومێکی تازەی بە ناونیشانی "دیسپۆتیزمی ڕۆژهەڵات" بۆ دیسپۆتیزم داناوە، مەبەستی لەو کۆمەڵگەیەیە ئەم خاسییەتانەی خوارەوەی تیادا بێت:

*١–حکومەتی تاکە کەسی "ئۆتۆکراسی"*[2]

*٢–شیرازەی وڵات بەسترابێت بە ناوەندی دەوڵەتەوە.*

*٣–نەبوونی یاسایەکی هەمیشەیی.*

*٤–لەو کۆمەڵگەیەدا پلەو پایەی بازرگانەکان نزم بێت.*

*٥–بایەخ نەدان بە کۆیلەداری.*

*٦–کشتوکاڵ بە ئاودێری فراوان بێت.*

بە بیروڕای فیتفوگل خاڵی دوایی بنچینەی خاسییەتەکانی ترە، ئەمجۆرە ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیو سیاسییە جگە لە چەند نەتەوەیەکی ئاسیایی ، شارستانێتیی پێست سوورەکانی ئەمەریکاش دەگرێتەوە.

### ★دۆگماتیزم - Dogmatisme

---

١–K.A.Witfogel

٢–Autocracy

زاراوەی "دۆگم" بە مانا "وەستاو" دەگرێتەوە، ئەو کارەی کە هەرگیز نابێت بگۆڕدرێت، بەو شێوازو بیرکردنەوەیە دەوترێت کە لەسەر پایەی مەفهوومی "نەگۆڕ" دامەزرابێت، وەکو یاساو دەستووره ئاینییەکان، بێ ئەوەی پەیڕەویی دەستکەوتە تازەکان‌و زانستی‌و کاری زانستییانە بکات، بێ ئەوەی بە پێی هەلومەرجی تایبەتیی شوێن‌و کات بجوولێتەوە..

دۆگماتیزم لەبەر باری سەرنجی فەلسەفییانەوە ڕاوەستانی واقیع دەگرێتەوە، واتە واقیع بە هەلومەرجی کات‌و شوێنەوە نابەستێتەوە. لە فەلسەفەی هاوچەرخدا دۆگماتیزم بە پاشکۆی شێوازی دژی دیالەکتیك دادەنرێ کە هەموو جۆرە جموجوولێکی جیهان‌و گەشەکردنی شت‌و دیاردەکان ڕەت ئەکاتەوە.. یەکێك لە مەینەتییەکانی دۆگماتیزم ئەوەیە کە هەست بە یاساکانی دیالەکتیك ناکات وەکو گەشەکردن لە هەلومەرجی جۆربەجۆری مێژووییدا.

لەبەر باری سەرنجی مێژووییشەوە پەیدابوونی دۆگماتیزم لەگەڵ پەیدابوونی ئاینەکان‌و باوەڕ بە ئاینەکان پەیدابووە، کە واقیع بە شتێکی هەمیشەیی وەستاوو نەگۆڕ دەزانێت. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە ئەنجامدا بووە فەلسەفەو زانین‌و سیاسەت.

لەبەر باری سەرنجی سیاسیشدا دۆگماتیزم ئەبێتە کارێکی سکتاریستیی، وەستان، ڕەتکردنەوەی تیۆری داهێنەرانە، جیاکردنەوەی تەواوی تیۆری‌و پراکتیك لە یەکتر. دۆگماتیزم هەر وەکو ڕیڤیژیۆنیزم لە هەلومەرجی ئێستادا مەترسییەکی گەورەی لەبەردەم ڕاپەڕینی نێو نەتەوەیی کرێکاراندا هەیە.

دۆگماتیکەکان باوەڕیان بە گۆڕین‌و گەشەکردن نییە، هەمیشە پەنا ئەبەنە بەر شێوازو یاسای مەیبوو نەگۆڕو کۆنە.. هەزاران ناوو ناتۆرە ئەدەنە پاڵ عونسوری شۆڕشگێڕو یاسا گشتییەکانی دیالەکتیك. ڕێکخراوە شۆڕشگێڕییەکان هەمیشە ئامۆژگاریی ئەندامەکانی خۆیان ئەکەن کە لە ڕەوشتی دۆگماتیکانە دوور بکەونەوە.

**★دیماگۆگی - Demagoge**

دیماگۆجی، بە "ساویلکە خەڵەتاندن" یان "خەڵك فریودان" لێکدراوەتەوە، دیماگۆگی بەو خەڵك خەڵەتاندنە دەڵێن لە ڕێگەی بەڵێن‌و دروشمی درۆوە چاوبەستیان لێبکرێت. دیماگۆگ ئەو کەسانەن هەوڵ ئەدەن بەدرۆو فیشاڵ خەڵك بۆ لای خۆیان ڕابکێشن‌و ڕاستی لەبەر چاوی خەڵکی بشارنەوە، دیماگۆجی باشترین نموونەی سیاسەت‌و شێوازی کارکردنی سیاسییانەی حزبە بۆرجوازییەکان‌و دەوڵەتە دژ بە خەڵکەکانن.. ئەو دەوڵەتانەی دژی خەڵکن، هەوڵ ئەدەن لە ڕێگەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە وەکو: ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، ڕۆژنامە، ئاگاداری دەرکردن، ڕیپۆرتاج، چاوپێکەوتن‌و.. ئەمجۆرە شتانەوە خەڵکی سادەو ساویلکە بخەڵەتێنن‌و باری سەرنجی خەڵك بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. دیماگۆجی یان خەڵك خەڵەتاندن، یان خەڵك فریودان، لەگەڵ سیاسەت‌و ڕێبازی ڕاپەڕینی مەنطقیانەی ڕێکخراوە شۆڕشگێڕییەکاندا ناگونجێت‌و هەموو پێشکەوتنخوازێك لەو ڕێبازەوە دوورە.

**★دیموکراسی - Democratie**

دیموکراسی یان دیموکراتی، زاراوەیەکی یۆنانییە، "دیمو" بە مانا خەڵك‌و "کراتوس" دەسەڵات دەگرێتەوە، واتا دەسەڵاتی خەڵك یان دەسەڵاتی گەل.. دیموکراسی جۆرە دەسەڵاتدارێتییەکی تایبەتە کە دەسەڵات بەدەست زۆربەی خەڵکەوە بێت. بەربەستی لەئازادی نەکرێت، ئەندامانی کۆمەڵ وەکو یەك یەکسان بن، کۆمەڵ شوناسە بۆرجوازییەکان دیموکراسی لە بابەتەکانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتیی جیا ئەکەنەوە، باری واقیعی‌و عەمەلیی کۆمەڵ لەبەرچاو ناگرن , ئەم جۆرە لێکدانەوە بۆجوازییانە ماهییەتی چینایەتی کۆمەڵ و ناکۆکی‌و ڕاپەڕینی چینایەتییانە ڕەت ئەکاتەوە.. ریفۆرمیستەکان ئەمجۆرە دیموکراسییەتەیان دەوێت‌و هەوڵی بۆ ئەدەن.

شێوەو ناوەرۆکی دیموکراسی بە درێژایی مێژوو پێگەیشتووەو هەمیشە بە فرماسیۆنی کۆمەڵایەتیی–ئابوورییەوە پابەند بووەو پەیوەندییەکی توندو تۆڵی لەگەڵ ڕاپەڕینی چینایەتیدا هەیە.

لە کۆمەڵگەی چینایەتیی پڕ لەناکۆکیدا دیموکراسی تەنیا بۆ دەسەڵاتداران‌و چینی فەرمانڕەوا هەیە.. لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا دیموکراسی یەکێکە لە شێوەکانی حوکم‌و دەسەڵاتداری چینی بۆرجوازی.

ڕوخساری تایبەتیی دیموکراسیی بۆرجوازی بریتییە لە پارلمانتاریزم.. لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا تەنیا هێزی ڕاپەڕیوی خۆڕاگری زەحمەتکێشان ئەتوانن ئازادییە دیموکراتییەکان بپارێزن‌و بەر لە کۆنە پەرستی‌و دیکتاتۆری‌و فاشیزم بگرن، بۆرجوازی لە هەر شوێنێکدا بۆی بکرێت دیموکراتییەت پێشێل ئەکات، بۆ ئەم مەبەستە لە زۆربەی وڵاتەکاندا ڕژێمی تیرۆریستییان دامەزراندووە. پەنا ئەبەنە بەر میلیتاریزم‌و فاشیزم بۆ ئەوەی بە هۆی ئەوانەوە خۆیان بگرنەوەو خۆیان بپارێزن.

لە بەرنامەی کاری کۆنفرانسی نێونەتەوەیی ڕێکخراوە شۆڕشگێڕی‌و کرێکارییەکاندا لە ساڵی (١٩٦٩)دا بەمجۆرە باسی ئەهمییەتی ڕاپەڕین لە ڕێگەی دیموکراتیدا کراوە:

"ڕاپەڕینی دژی ئیمپریالیزم کە ئەیەوێت ئازادییە بنچینەییەکانی ئادەمیزاد لەناو ببات، پێویستیی بە جەنگێکی درێژ خایەن هەیە، بۆ بەدەستهێنانی ئازادیی چاپەمەنی، کۆبوونەوە، خۆنیشاندان، ڕێکخستن.. لە پێناوی یەکسانیی مافی ئەندامانی خەڵك‌و دیموکراتیزەکردنی هەموو ڕووکارەکانی ژیانی کۆمەڵ. هەروەها پێویستە دژی هەر جۆرە هەوڵدان‌و یاسایەك بین کە کۆنەپەرستان بە نیازی لەناوبردنی مافی ئازادییە دیموکراتییەکان دایئەنێنن , ئازادییە دیموکراتییەکان بەرهەمی خەبات‌و ڕاپەڕینی درێژخایەنی چینەکانن، چ لە بواری نەتەوایەتی یان لە بواری نێونەتەوەییدا.."

**★دەوڵەت - Repoplice**

دەوڵەت ڕێکخراوێکی سیاسیی کۆمەڵ‌و گرنگترین هۆی دەسەڵات گرتنەدەستی چینێکە کە لە ڕووی ئابوورییەوە ڕۆڵێکی گرنگ لە کۆمەڵدا ئەگێڕن. ئەرکی سەرەکیی دەوڵەت هێشتنەوەی ڕژێمی ئابووری‌و داکۆکی کردنە لەسەر چینی فەرمانڕەوا.. لەبەر باری سەرنجی مێژوویدا دەوڵەت لە کاتی پەیدابوونی کۆمەڵگەی چینایەتییەوە ئەویش پەیدابووە. لەو کاتەوە کە کۆمەڵ دوو چین بوون واتا

"کۆیلەو کۆیلە دارەکان"، دەوڵەتیش وەك ئۆرگانێکی سیاسی بۆ پاراستنی قازانجی خاوەن کۆیلەکان لە دژی کۆیلەکان پێکهاتووە. دەوڵەت بەڕێوەبردنی ئیشو کارو ئەرکەکانی خۆی خستووەتە سەر دەزگاکانی لەشکر، پۆلیس، ئەمن، بەندیخانەکانو هینی تر.. دەوڵەتەکان جیاوازیی لە نێوان جۆرو شێوەکانیاندا هەیە، هەر دەوڵەتێك ڕژێمی ئابووریی خۆی هەیە، خۆی دەستنیشانی ئەکاتو جۆرەکانی دیاریی ئەکات. لە دەروونی مێژوودا (٣) سێ جۆر دەوڵەت پەیدابووە:

*١-دەوڵەتی کۆیلەداری.*

*٢-دەوڵەتی فیودالّی "دەرەبەگایەتی".*

*٣-دەوڵەتی سەرمایەداری.*

لە هەر یەك لە ڕۆژگاری کۆمەڵایەتی-ئابووریی هەر دەوڵەتێکدا جۆری دەوڵەت تایبەتو جیاوازە، ماهییەتی چینایەتیو ئابووریی هەر کۆمەڵێك جۆرو ڕوخساری دەوڵەتەکەی دیاری ئەکات. جۆری دەوڵەتەکان بە زۆری پابەندن بە هەلومەرجی مێژوویی کۆمەڵەوە. بۆ نموونە کۆماریو سەڵتەنەتی هەردووکیان هەر دەوڵەتنو هەر یەك لە مانەش جۆرو ڕوخسارێکی جیا لەویتری هەیە.. وەکو سەڵتەنەتی مەشروطە "مەرجدار" یان سەڵتەنەتی زۆرداری، کۆماری لەگەڵ دەسەڵاتی پەرلەماندا یان کۆماری بە ئارەزووی سەرەك کۆمار، بەڵام شێوەی دەوڵەتەکان بە پێی ڕۆژگارو دۆخی وڵاتەکە ئەگۆڕدرێت.

### ★دیالەکتیك - Dialectic

مانای دیالەکتیك جموجوڵی ڕاستییە لە ڕێگەی وتووێژەوە، هەروەها بە ماناش گفتوگۆ ئەگرێتەوە لە ڕێگەی پرسیارو وەڵامەوە، یەکەمجار (زنوون الثاني) ئەمەی دۆزیوەتەوەو ئەفلاتوون گەشەی پێداوە.

هیگڵ ئەم وشەیەی بە مانای تازە لێکداوەتەوەو وەکو فەلسەفەی گشتیی لێکردووە، دیالەکتیکی هیگڵ فەلسەفەیەکە ئەڵێت: هەموو شت پێکەوە پەیوەندیدارن، هەموو شت لە جووڵانو گۆڕینی هەمیشەییدایە، ئەم گۆڕانەش بە پێی یاسایەکی دیارو مەعقول ڕوو ئەدات. لەو یاسایەدا "ناکۆکی" دەورێکی گەورە ئەبینێت. گۆڕین لە ئەنجامی ئەو ناکۆکیانەوە پەیدا ئەبێت، بەڵام لە کاتی گۆڕاندا ناکۆکییەکان یەکانگیر ئەبن، واتە یەك ئەگرنو ئەمەش پێی ئەڵێن: "یاسای یەکگرتنی ناکۆکییەکان".. لە واقیعدا لە هەر ڕاپەڕینێکدا یەکێتییەك خۆی شاردووەتەوە، لە ئەنجامدا دیالەکتیك ئەوە ئەسەلمێنێت، کە هەموو گۆڕینێك لە کۆتاییدا، دوای ئەوە کە کێشەی نێوان ناکۆکییەکان گەیشتە قۆناغێکی تایبەتی لە ناکاو هەموو ڕێ ئەکەون، وە لەو ڕێککەوتنە شتێکی تازە پەیدا ئەبێت، کە ڕوخسارو ناوەڕۆکێکی تازەی ئەبێت.

تیۆری زانەکان دیالەکتیکی هیگڵ یان بۆ دەرخستنی ماددی مێژوو بەکارهێناوەو فەلسەفەکانی خۆیشیان ناو ناوە "ماتەریالیزمی دیالەکتیك". بەرامبەر بە ئایدیالیزمی دیالەکتیکی هیگڵ.. شێوازی دیالەکتیکی ئەو تیۆری زانانە بەم جۆرەیە:

أ-دیالەکتیك پێچەوانەی فەلسەفەی میتافیزیك هەموو سروشت پێکەوە پەیوەندیدار دائەنێت، کە لە سروشتدا هەموو جۆرە دیاردەو شتوومەکێك پێکەوە بەندنو یەکتر تەواو ئەکەن، یان یەکتر دیاری ئەکەن.

ب-دیالەکتیك پێچەوانەی میتافیزیك، لەو باوەڕەدایە کە سروشت هەمیشە لە حاڵەتی گۆڕاندایە، وە هەمیشە تازە ئەبێتەوە.

ج-دیالەکتیك پێچەوانەی فەلسەفەی میتافیزیك، هەنگاوەکانی گەشەکردن بە گۆڕینێکی لەسەر خۆو سادە دانانێت، بەڵکو بە گۆڕینی لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تری دائەنێت.

د-دیالەکتیك پێچەوانەی فەلسەفەی میتافیزیك ناکۆکیی دەروونی لەناو هەموو دیاردەکانی سروشتدا بەدی ئەکات، لێکدانی ئەم ناکۆکییانە بە بنچینەی گەشەکردن دائەنێت.

### ★دیپلۆماسی - Diplomacy

ئەم زاراوەیە لە وشەی "دیپلۆمات"ی فەرەنسەییەوە هاتووە کە بە مانا نوێنەری سیاسیی دەوڵەتێك ئەگرێتەوە لە دەوڵەتێکی تردا، وە هەروەها لە وشەی "دیپلۆما"ی یۆنانیو لاتینی وەرگیراوە کە ئەویش بە مانا قاقەزی تاکە پەڕە سەنەدو مۆر ئەگرێتەوە.

***دیپلۆماسی لە زانستی سیاسەتدا (٣) سێ مانای هەیە:***

**یەکەم:**

فراوانترین مانای دیپلۆماسی پەیوەندیی سیاسیی نێوان دوو دەوڵەتە، تیۆری زانە سیاسییەکان دیپلۆماسی بە مانای عونسورێکی دەسەڵاتی گەل ئەزانن‌و هەندێکی تریش بە تەنیا هۆی بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسیی خەڵکی دائەنێن. لەم دواییانەدا دیپلۆماسی وەکو هۆو ڕەوشتی ڕێبازی ڕژێم دانراوە.

**دووەم:**

هونەری خۆسازاندن لە سیاسەتی نێودەوڵەتاندا کە لە جیاتی مەترسیی قازانج‌و ئاسایشی وڵات بپارێزێت‌و بەهێز تری بکات.

**سێیەم:**

دیپلۆماسی وەکو دەزگایەکی کارگوزاریی پەیوەندیی نێودەوڵەتان ناو ئەبرێت، یەکێك لە گرنگیو نرخی دیپلۆماسی، پەیوەندیی سیاسیی نێو دەوڵەتەکانە کە لە جیاتی جەنگو لە گەیشتن بە ئامانج لە ڕێگای وتووێژو کاری سیاسییانەو خۆ سازدانەوە بگەنە ئەو ئامانجە. "لەسەر ئەم بنچینەیەو تێڕوانینە هەڵگیرساندنی شەڕ بە مانا شکستی دیپلۆمات ئەگرێتەوە. لە ساڵی (١٩٥٠) بە دواوە هەندێك لەو باوەڕەدان کە ئیتر هیچ دەوڵەتو گەلێك ناتوانن لە ڕێگەی جەنگەوە بگەنە ئەو ئامانجەی کە پێویستیانە، بەڵام هەندێکی تر ئەڵێن جەنگی سنووردار وەکو هۆیەکی سیاسییانە بەکار ئەهێنرێت".

### ★دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا - Dictature du Proletariat

بریتییە لە دەسەڵاتی چینی کرێکار، کە لە ئەنجامی لەناوبردنی ڕژێمی سەرمایەداریو تێکشکاندنی چەرخەکانی دەوڵەتی بۆرجوازی دێتە کایەوە. دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا ناوەڕۆکی بنچینەیی شۆڕشی سۆشیالیستانەو مەرجی گەورەی ئەنجامی ئەو شۆڕشەو سەرکەوتنەکانیتی. گەورەترین بنچینەی تیۆریی شۆڕشگێڕانەیە. پرۆلیتاریا بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی داگیرکارانو گەڕانەوەی دەسەڵاتی بۆرجوازیو لەناوبردنی کۆنەپەرستی، سوود لە دەسەڵاتی سیاسیی خۆی وەر ئەگرێت.

ئەم دیکتاتۆرییە بە مانا کرداری زۆرەملێیانە نییە لە دژی چینە دەسەڵاتدارەکان، بەڵکو کردارێکی عەمەلییانەو بونیاتنەرانەیە. هۆیەکە بۆ ڕاکێشانو ڕامکردنی کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێش بۆ لای چینی کرێکارو یەك خستنیان لە قەوارەی کۆمەڵگەیەکی تازەدا.

گەورەترین هۆی بونیاتهێنانی هەمە لایەنیانەی ژیانی کۆمەڵ وەکو: ئابووریو سیاسەتو فەرهەنگ (کولتوور)و شێوازی ژیانو پەروەردەکردنی شۆڕشگێڕانەو بونیاتنانی کۆمەڵگەیەکی نوێ. کەرەسەی گشتیی بونیاتنانی قەوارەی سۆشیالیزمە.

دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا، ئەنجامی گەشەکردنی ڕاپەڕینی چینایەتیانەیە لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا، زەمینە بۆ جێبەجێکردنی فراوانترین شێوازی دیموکراتی بە قازانجی زۆربەی کۆمەڵانی زەحمەتکێشی خەڵك لە دژی کەمایەتییە داگیرکارەکان ئەڕەخسێنێت. ئەوەش بزانین کە دیموکراتی ترین شێوەی کۆماریی بۆرجوازی جگە لە دەسەڵاتی کەمایەتییە زۆردارەکان بەسەر زۆربەی خەڵکە زەحمەتکێشەکاندا هیچی تر نییە.

باڵاترین شێوەی بریتییە لە یەکێتیی نێوان چینی کرێکارو جوتیارەکان بە ڕابەرایەتیی چینی کرێکار. پایەی کۆمەڵایەتیی ئەم دیکتاتۆرییە لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا فراوانترو مەحکەمتر ئەبێت. ئەو هێزەی کە ڕابەری بنچینەیی سیستمی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا ئەکات، پێشڕەوەکانی چینی کرێکارە. ئەمە نەك تەنیا لەگەڵ دیموکراتیی سۆشیالیستیدا ئەگونجێ، بەڵکو زامنی پاراستنیشی ئەکات، چونکە دیموکراتییەت خزمەتی خەڵك ئەکاتو قازانجی زۆربەی خەڵك ئەپارێزێت کە ئەوانیش چینی زەحمەتکێشن، چونکە دیموکراتی تا ئەو کاتەی کە ناکۆکیی چینایەتی هەبێت ئەویش وەك مەسەلەیەکی چینایەتیی دیار ئەبێت.

لە بارەی مێژووییەوە یەکەمین شێوەی دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا کۆمۆنی پاریس بوو لە ساڵی (١٨٧١)دا.. کە گەلێك تاقیکردنەوەی مێژوویی گرانبەهای بە بیروباوەڕی پێشکەوتووانە بەخشی..

### ★دیواری چین - China Wall

دیوارێکی زۆر گەورەو درێژە، لە ماوەی چەندان سەدەدا بە ملیۆنەها کەس کاریان تیادا کردووەو کەوتووەتە بەشی ژووروویی وڵاتی چینەوە. بەشێکی زۆری ئەم دیوارە بە تایبەتی لە سەدەی سێیەمی پێش زاییندا دروست کراوە. ئەم دیوارە لە پارێزگای "گانسۆ" تاکو دەریای زەرد درێژ بووەتەوە، بە مەبەستی پاراستنی ناوچەکانی خوارووی وڵات دروستکراوە. نزیکەی چوار هەزار کیلۆمەتر درێژەو بەرزییەکەشی خۆی ئەدات لە (١٠)دە مەترەو –لە هەندێك شوێندا زیاتریش–حەوت مەتریش پانییەکەیەتی.. ئێستاکە بەشێکی زۆری ئەو دیوارە وێران بووە، بە هۆی ئەو دیوارەوە بەشێکی زۆری وڵاتی چین –بەتایبەتی ناوچەکانی خوارووی– لە ناوچەی ژووروو جیاکراوەتەوە.

زاراوەی دیواری چین لە گفتوگۆی سیاسییانەو کۆمەڵایەتییانەدا بە مانا جیاکردنەوەی تەواوی شتێکە لە شتێکی تر.. یان جیا کردنەوەی باسو ڕێبازێکە لە باسو ڕێبازێکی تر.. بۆ نموونە: ئەگەر بڵێین: دیواری چین لە نێوان شۆڕشی بۆرجوازیی دیموکراتیو شۆڕشی سۆشیالیستیدا نییە، واتە ئەم دوو مەسەلەیە لە یەکتر جیانین. یان بڵێین ڕژێم ناتوانێت لە نێوان چینی کرێکارو کۆمەڵانی خەڵکدا دیواری چین دروست بکات، واتە هەرگیز توانای ئەوەی نابێت پەیوەندییە بنچینەییەکانی نێوان چینی کرێکارانو زەحمەتکێشان لەناو بباتو جیاوازی بخاتە نێوانیانەوە.

### ★ڕیالیزم - Realism

بە مانا واقیع پەرستییە، بەرامبەر بە ئایدیالیزم "یان بڵێین خەیاڵ پەرستی".. ڕیالیست بەو کەسە ئەڵێن کە باوەڕی بە ڕاستی بێتو لە کارو کرداریدا ڕاستو واقیع بین بێت. هەندێك جار بەو کەسانە ئەوترێت کە ئەوەی پێی ئەسپێرن بە ئەنجامیبگەیەنێت. ڕیالیست هەوڵ ئەدات لەگەڵ واقیعی خەڵكو ناوچەو دەوروبەرو جیهاندا بڕواتو بگونجێت. ئایدیالیست هەوڵ ئەدات جیهانو هەموو چۆنێتییەکان بخاتە ناو جوغزی ئایدیالیستییانەی خۆیەوە.

### ★ڕیفر اندۆم - Rererandum

را وەرگرتنی راستەوخۆی ئەندامانی رێکخراوێك یان كۆمەڵێکە بۆ دەنگدان لەسەر بابەتێکی سیاسی کە رابەران‌و نوێنەرانی خۆیان هەڵبژێرن. یەکەمجار تەنیا بۆ دانانی یاسا ئەمجۆرە دەنگدانە ئەکرا، لە ساڵی (١٨٣١)دا بۆ یەکەمین جار هەڵبژاردن کرا، دوای ئەوەی بۆ هەر کارێکی پێویست وەکو یاسادانان‌و ئەمجۆرە شتانە هەڵبژاردنی بۆ ئەکرا. لە ساڵەکانی (١٨٩٨–١٩٥٧) لە بیست‌و یەك ناوچەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا هەڵبژاردنیان کردووە.

***یەکەم:*** زۆرە ملێیانە.

***دووەم:*** ئارەزوو خوازییانە.

جۆری زۆرەملێیەکە بە زۆری بۆ دانانی یاسای بنچینەیی وڵاتە، جۆرەکەی تریان لەسەر ویست‌و داخوازیی خەڵکە، لە ساڵی (١٩٤٦ )ەوە تا ئێستا لە فەرەنسە سێ جار بۆ گۆڕینی یاسای بنچینەیی وڵات هەڵبژاردن کراوە. دوا هەڵبژاردن لەو وڵاتە لە ساڵی (١٩٦١)دا لە بارەی سەربەخۆیی جەزایرەوە بوو.

**★رادیکاڵیسم - Radicalisme**

رادیکاڵ لە زمانەوانیدا بە مانا بنچینەیە، یان ڕەگ‌و ڕیشە هاتووە، رادیکاڵیزم بە مەفهوومی گشتی بەرێبازی ئەو کەسانە ئەوترێت کە ئەیانەوێت هەموو کاروبارێك بە تەواوەتی بکرێ‌و بنچینەیی بێت. رادیکاڵیزمی بۆرجوازیش هەیە بە رێبازێکی سیاسی ئەوترێت کە چارەسەرکردنی دیموکراتییانە لە چوارچێوەی بەرنامەی سەرمایەداریدا دیاری بکات‌و لە واقیعدا قازانجی توێژەکانی وردە بۆرجوازی بپارێزێت.

دیسانەوە بە مەفهوومی گشتی زاراوەی رادیکاڵ بەمجۆرە بەکار ئەهێنرێت وەکو "ئێمە ئەمانەوێت گۆڕینێکی رادیکاڵیانە بکرێت".. وە یان "فلان مەسەلە پێویستیی بە گۆڕینی رادیکاڵییانە هەیە".. واتە ئێمە ئەمانەوێت گۆڕینێکی بنچینەییانە بکرێ، وە یان فلان مەسەلە پێویستیی بە گۆڕینی بنچینەیی یان ڕیشەیی هەیە.

**★ڕاسیسم - Racisme**

ڕاسیزم یان ڕەگەز پەرستی لە وشەی (راس) کە بە مانا "ڕەگەز" ئەگرێتەوە وەرگیراوە. ڕاسیزم تیۆرییەکی دژی زانستی‌و کۆنەپەرستانەیە، کە لە ناو ڕەگەزە جۆر بە جۆرەکاندا لە رووی ژمارە‌و دەسەڵاتی فیکرییەوە نا بەرابەرییان ئەوێت. گوایە سروشت لە سەرەتاوە ئەم ڕەگەزانەی نا یەکسان، واتە یەکێك بەرز‌و یەکێك نزمی دروستکردووە.

ڕەگەز پەرستەکان بە پێی ئەم تیۆرییە بە تەواوی کۆنەپەرست‌و دژی مرۆڤ‌و بەربەرەکانێی یەکسانی بوونی ئادەمیزاد ئەکەن. لە کاتێکدا زانست‌و تاقیکردنەوە ئەوەی سەلماندووە کە جیاوازیی نێوان ڕەگەزەکان شتێکی رووکەشە‌و لە رووی گەشەکردن‌و ئامادەبوون‌و توانای فیکری‌و مەعنەویی‌و چالاکیی کۆمەڵایەتی‌و زانستییەوە هیچ ئەهمییەتێکی نییە.

کۆنەپەرستی لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا پشت بە تیۆری ڕەگەز پەرستی‌و سیاسەتی دژی مرۆڤ ئەبەستێ‌و پاڵە پەستۆیەکی زۆر ئەخاتە سەر کەمە نەتەوایەتییەکان‌و ڕەگەزە بچووکە ژێر دەستەکان، هەموو مافێکیان زەوت ئەکەن‌و کاری زۆر ناڕەوایان بەرامبەر ئەکرێ، ئەو کردارە نامرۆڤانەیەی کە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دژی ڕەش پێستەکان‌و سوور پێستە بوومییەکان ئەکرێ، یان لە ڕۆدیساو ئەفەریقای خواروو لە دژی ڕەش پێستەکان ئەکرێ هەمووی ئاشکرایە.

لەگەڵ ئەوەشدا نووسراوەی مافی ئادەمیزاد چەندە سەرزەنشتی جیاوازیی ڕەگەزایەتی ئەکات‌و تیۆری "ڕاسیزم" لە جیهانی سەرمایەداریدا ڕەت ئەکاتەوە‌و بە تیۆرییەکی کۆنەپەرستانەی دژ بە خەڵکی دائەنێت.

زانستی مرۆڤ شوناسی‌و خەڵك شوناسی مێژوو، هەروەها تاقیکردنەوەی وڵاتە پێشکەوتووەکان کە ستەمی نەتەوایەتییان تیا لەناوچووە بە پێی ئەو نوونانەی کە ڕەگەزە جۆر بە جۆرەکان لە زەمینەی زانستی، هونەری، ئەدەبی، کۆمەڵایەتی،.. خۆ رێکخستنەوە چالاکییان هەیە، تۆماری تیۆری ڕەگەز پەرستی درۆزنانەیان دڕیوە. شارستانێتی، پێشکەوتن، زانست، تەکنیك، فەرهەنگ.. ئەمانە میراتیی تایبەتی ڕەگەزێك نین. دواکەوتن لە هەر شوێن‌و ناوچەیەکدا بێت جەمسەرەکەی بەستراوە بە ستەم‌و داگیرکارانەوە.

**★ریفۆرم - Reforme**

ریفۆرم بە مانا کاری چارەسەرییانەیە، کە بۆ گۆڕینی هەندێك رووکاری ژیانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی ئەکرێ، بێ ئەوەی کە گۆڕینێکی بنەڕەتیی تەواو لە کۆمەڵدا دروست بکات. وەکو ریفۆرمی زەویوزار، ریفۆرمی ئیداری، ریفۆرمی فێرکردن، ریفۆرمی بازرگانی، ریفۆرمی هەڵبژاردن‌و..

ریفۆرم، ئەو جۆرە گۆڕانەیە کە لە ناو چوارچێوەی ڕژێمی کۆمەڵایەتی تێ ناپەڕێت‌و توانای هێزە سیاسییەکان تا رادەیەك نیشان ئەدات.. ریفۆرم لە هەر کات‌و زەمینەیەکدا بکرێت بەرهەمی خەباتی کۆمەڵانی خەڵکە، بەڵام چینی دەسەڵاتدار هەوڵ ئەدات لە رێگەی ریفۆرمەوە بەرگیری لە هێرشی کۆمەڵانی خەڵك بە تایبەتی چینی کرێکار بکات. بۆ ئەوەی زیان لە دەسەڵاتی خۆی نەکەوێت.. بەمەش مەبەستی هەرە گەورەی ئەوەیە بەرگیری لە گۆڕینی بنەڕەتیی کۆمەڵ بکات. دیسان هەوڵی ئەوەش ئەدات ئەوەی کە بە زۆر لێی وەرگیراوە بەرە بەرە لە کۆمەڵانی خەڵکی وەربگرێتەوە‌و بیانباتەوە دۆخی رابردوو.

**تیۆری زانێك لەم ڕووەوە وتوویەتی :**

*"مـەفهوومی ڕیفۆرم لەگەڵ مەفهوومی شۆڕشدا لە یەکتر جیان، ئەگەر ئەمە فەرامۆش بکەین‌و هەست بە مێڵی نێوان ئەم دوو مەفهوومە نەکەین، ئەوا ئەکەوینە هەڵەی گەورەوە، بەڵام ئەم سنوورەی نێوان ئەم دوو مەفهوومە شتێکی وەستاو نییە، بەڵکو هەمیشە لە گۆڕاندایە.. وە لە هەمووکات‌و سەردەمێکدا پێویستە ئەو مێڵە دیاری بکرێت".*

تـیۆری شۆڕشـگێڕانە بەرهەڵسـتی ڕیفـۆرم ناوەسـتێ، ئەو ڕیفۆرم‌و کارە چارەسەرییانە ڕەت ناکاتەوە کە لە جیهانی سەرمایەداریدا ئەکرێـت.. وە هـەروەها ڕیفـۆرم بـە لقـێك لـە لقـەکانی شـۆڕش دائەنێـت. شۆڕشـی کۆمـەڵانی خەڵك هەندێك کات کە سەرکەوتوو نابێت دەزگـای دەسـەڵاتدار ناچـار ئەکات پەنا بەرێتە بەر یاسای ڕیفۆرم. پێویستە ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکان دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بە جۆرێك ناچار بکەن کە زۆرترو قووڵتر ڕیفۆرمەکان جێبەجێ بکات . هەر وەکو تیۆری زانێك وتوویە:

"پێویستە بۆ فراوانبوونی زەمینەی ڕاپەڕینی چینایەتی سوود لەڕیفۆرمەکان وەربگیرێت".

ئەگـەر لـە ڕیـزەکانی ڕاپەڕیـنی کۆمـەڵانی خـەڵکدا کەسـێك بـە یاسای ڕیفۆرمەکان قایل بێت پێی ئەڵێن "ڕیفۆرمیست". ڕیفۆرمیزم زاراوەیەکـە لـەناو ڕاپەڕیـنی سیاسـیی کۆمـەڵانی خـەڵکدا دوژمـنی هـەرە گەورەی قازانجی چینی زەحمەتکێشە. ڕیفۆرمیست ڕاپەڕینی چـینایەتی‌و شـۆڕش ڕەت ئەکاتـەوەو لایەنگری ئەو ڕیفۆرمانە ئەکات کە زیان بە بونیادی سەرمایەداری ناگەیەنێت. کەوابوو ڕیفۆرمیزم مانای خۆ بەدەستەوەدان ئەگرێتەوە.

**ڕیفۆرمی زەویوزار:**

ڕیفۆرمـی زەویـوزار یـان چارەسـەرکردنی زەویـوزار بریتـیە لـە کۆمەڵـە کردارێك کە دەوڵەت لە بارەی گۆڕینی جۆری موڵکدارێتیی زەویوزارو شێوەی سوود وەرگرتن لە زەوی ئەیکات.

لـە وڵاتـە سـەرمایەدارییەکاندا مەبەسـت لـە ڕیفۆرمـی زەویـوزار ئەوەیـە زەمیـنەیەکی لـەبار بـۆ گەشـەکردنی پەیوەندیـیەکانی سـەرمایەداری لـە لادێکـاندا بڕەخسێ‌و ڕاپەڕیـنی جووتیاران لاواز بکات‌و بەرگیری لە هەر جۆرە ڕاپەڕینێکیان بکات. بەمجۆرە ڕیفۆرمە سـەرمایەدارە خـاوەن سـنعەتەکان‌و خـاوەن بانقـەکان‌و پـیاوە دەوڵەتیـیە گـەورەکان‌و سـوپاییە دەسـەڵاتدارە گـەورەکان‌و زۆربـەی دەوڵەمـەندەکانی تـر ئـەتوانن جـێگەی خۆیـان مەحکـەمتر بکـەن‌و شـێوەی دەسـت بەسەرداگرتنی سەرمایەدارییانە کە جێگری دەست بەسەرداگرتنی سەردەمی پێش خۆیەتی زیاتر بچەسپێنن. ئەمجۆرە ڕیفۆرمە ئەگەرچی لە ڕووی ئابوورییەوە ئەتوانێت سوود لە زانستی تەکنـیك‌و مەکانـیزەکردنی زەویـوزار وەربگرێـت، بـەروبوومی کشـتوکاڵی زیاتـر بکـات، بـەڵام لـە ڕووی بـاری کۆمەڵایەتیـیەوە زۆربـەی جووتـیارەکان ماڵوێـران ئەکات‌و ناکۆکیی گەورەتر دێنێتە کایەوە، چونکە ناتوانێت بە شێوەیەکی ڕادیکاڵییانە مەسەلەی زەویوزار بنبڕ بکات.

سیستـمی سۆشیالیسـتی هـەموو جـۆرە چەوساندنەوەیەك لە لادێکاندا لەناو ئەبات‌و زەویوزار بۆ هەموو جووتیارەکان دابین ئەکات، هـێزی کـاری جووتـیارەکان لەسـەر ئـارەزووی خۆیـان لـە کێڵگە هەرەوەزییەکاندا کـۆ ئەکاتـەوە.. تەکنیکی هاوچەرخیان ئەخاتە ژێر دەسـەڵاتەوە. یارمەتـیی مـادی‌و ڕێکخسـتنیان ئـەدات‌و هۆیـەکانی پێشـکەوتنی ئـابووری کشتوکاڵییان بۆ دابین ئەکات‌و بەمجۆرە باری گوزەرانیان ئەگۆڕێ‌و بەرەو پێشتر ئەچێت.

**★ڕیڤیژیۆنیزم - Revisionisme**

بـەو کەسانە ئەڵـێن سـەرنجی تـازە ئـەدەن، بریتییە لەو ڕێبازە لەناو ڕاپەڕینی کرێکاراندا بە بێ هیچ جۆرە پاڵپشتێکی ڕۆشنبیرانە سـەرنجی تـازە لـە بنچـینەکانی تـیۆری شۆڕشـگێڕانە ئـەدەن‌و ڕەتـی ئەکەنـەوەو لـە ڕێگای لا ئەدەن، ناوەڕۆکی شۆڕشگێڕانەو هەموو ئامۆژگارییـەکانی ئەدەنـە دواوەو لـەناوی ئەبـەن. بـە واتایەکی تر ڕیڤیژیۆنیزم واتە سەرنجدانی تازە لە هەندێك بنچینەو شێوازەکانی.. بـێ ئـەوەی پاڵپشـتێکی ڕۆشـنبیرانەیان لـەم بارەیـەوە هەبێـت. ڕیڤیژیۆنـیزم کـرێکار لە چەکی تیۆریی سیاسیانە بێ بەش ئەکات. بەم کـارەش خزمەتـێکی زۆر گـەورە بـە ڕژێمـی سـەرمایەداری ئـەکات. ڕۆشـنبیریی پرۆلیـتاریاو سۆشیالیزمی زانستی، زانستییەکی بونیات نەرانەیـە.. دۆگماتیزمی نییە، زانستییەکە لەگەڵ پێگەیشتنی ژیان‌و گەشەکردنی کۆمەڵ‌و پەیدابوونی دیاردەی تازەدا بەهێز تر ئەبێت‌و باشتر پێ ئەگات.

لـە ڕووی مـێژووەوە لـە دوا دەیـەی سـەدەی ڕابـوردوودا ڕیڤیژیۆنـیزم پـەیدابووە، کە لەو کاتەدا یەکێك لە سۆشیاڵ دیموکراتەکانی ئەڵـەمان کـە نـاوی برنشتاین بوو بە ئاشکرا دەستیکرد بە ڕەتکردنەوەی یاسا بنچینەییەکانی تیۆری شۆڕشگێڕانەو دانانی تیۆری تر لە جـێگەی.. شـێوەیەکی تـر لـە ڕیڤیژیۆنـیزم ئـەو هەوڵدانـەی کاوتسـکی بـوو کـە یەکێك بوو لە ڕابەرە دەرکەوتووەکانی هەمان سۆشیاڵ دیموکراتی ئەڵەمان.

ڕیڤیژیۆنیسـتەکان ئەڵێن ئامۆژگاری‌و یاساکانی تیۆری زانستیی کۆن بووە، بەم پێیە ماهییەتی لە بواری گۆڕانی کۆمەڵ‌و بونیاتنانی تازەی کۆمەڵ‌و سەقامگیربوونی سۆشیالیزم دوور ئەخەنەوە.

لەبـەر بـاری سـەرنجی فەلسـەفییانەدا ڕیڤیژیۆنـیزم سـەرنجی تـازە لە شێوازەکانی دیالەکتیکی ماتەریالیستی ئەدات‌و ئایدیالیزم لە جـێگەی دائەنێـت. ڕیڤیژیۆنـیزم بە لای چەپ‌و لای ڕاستدا لە شێوازی شۆڕشگێڕانە بەدوورەو خۆی لێ لا ئەدات. ڕیڤیژیۆنیزمی ڕاست لە

پێناوی قازانجی ڕاستەو خۆی بۆرجوازیو ئاشبەتاڵی شۆڕشی کۆمەڵایەتیو کڕنووشو خۆ بە دەستەوە دانو شێوازی ئەپۆرتۆنیزمانەو ریفۆرمیزمانەدا کار ئەکات. ریڤیژیۆنیزمی چەپیش واتا سەرنجدانی تازە لە شێوازو یاسای شۆڕشگێڕی ئەداتو بە قازانجی چینی دەسەڵاتدارو بۆرجوازی کار ئەکات.

**★زایۆنیزم - Scionisme**

ڕێبازێکی ناسیۆنالیستیی کوێرانەی بۆرجوازیی جوولەکەیە، لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا لە ئەوروپا سەریهەڵدا، ئێستاش بووە بە ئایدیۆلۆجیی ڕەسمیی دەوڵەتی دەست درێژکاری ئیسرائیل. ئەم ناوە لە وشەی "سەهیۆن"ەوە هاتووە کە ناوی ناوچەیەکە لە نزیک "ئۆرشەلیم"و جوولەکەکان بە لایانەوە شوێنێکی پیرۆزەو خۆشیان دەوێت.

لە ساڵی ١٨٩٧دا ڕێکخراوی زایۆنیی جیهانی پێکهات کە مەبەستو ئامانجی کۆچکردنی هەموو جوولەکەکان بوو بۆ فەلەستین.. ئێستا وزەی دارایی ئەم ڕێکخراوە بەرامبەر بە وزەی دارایی گەورەترین کۆمپانیای جیهانییە، چەندان کۆمپانیای ئیسرائیلیو خاوەن زەوییوزاری گەورەو دەزگاو دامەزراوی کشتوکاڵیو کارگەی بەرهەمهێنان ئەندامی ئەو ڕێکخراوەن.

مەڵبەندی ڕێکخراوەکەیان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایەو سەرپەرشتیی چالاکیی لقو کۆمەڵە زایۆنییەکانی زیاتر لە ٦٠ شەست وڵاتی جیهانی ئەکات. گەلێك ڕێکخراوی لقیو کۆمیتەو یەکێتیی فراوانیان هەیە، پێویستە ئەوە بڵێین کە زایۆنیستەکان لە سەرەتاوە لە پێناوی پاراستنی قازانجو ساتو سەودای دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان ئامادەبوون بنکەی خۆیان لە ئەمریکای لاتین یان کینیا یان ئۆگەندە یان لە ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا دابنێن.

بۆرجوازی جوولەکە چەندان ساڵە دەستیان کردووە بە گەشەپێکردنی هەستی ناسیۆنالیستیو نەتەوەپەرستیی کوێر بینانەو لە ژێر ئاڵای زایۆنیزمدا بەو پەڕی توانایانەوە هەوڵیانداوە ئەم ڕێبازەیان لە پێناوی خزمەت بە کۆنەپەرستانو ئیمپریالیزمدا گەشە پێبدەن.

زانیۆنیستەکان وا بیر ئەکەنەوە نەتەوەیەکی سەربەخۆی جوولەکە هەیەو پێویستە هەموو جوولەکەکانی ئەم جیهانە لەخۆیا کۆبکەنەوە.. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لەبەر باری سەرنجی سیاسییانەدا بیرکردنەوەیەکی کۆنەپەرستانەیە. لەبەر باری سەرنجی زانستیانەشەوە دیسان بێ پایەو نامەنطیقانەیە.

زایۆنیزم جوولەکە بە نەتەوەیەکی شاز ئەزانێتو وای دائەنێت کە جوولەکە دیاردەیەکی خواوەندیانەیەو نامەیەکی تایبەتییان هەیە. زایۆنیزم بەر لە هەموو شتێك لەگەڵ قازانجی پرۆلیتاریای جوولەکەدا ڕێك ناکەوێت.. زایۆنیزم چەندان ساڵە هەوڵی دروستکردنی دوو بەرەکایەتیو ناکۆکی نانەوە ئەدات لە نێوان جوولەکەی وڵاتەکانو ئەو خەڵکانەی لە گەڵیاندا ئەژینو هەوڵ ئەدات هەمیشە ڕقە بەرایەتیو دوژمنایەتیی لە نێوانیاندا بخولقێنێتو بەهێزیان بکات.. ئینجا لەم ڕووەوە هیچ جیاوازییەك لە نێوان زایۆنیزمو ئانتی سمیتیزمدا نییە. هەردووکیان زایۆنیزمو ئانتی سمیتیزم "دژی جوولەکە" ڕێبازێکی کۆنەپەرستانەو ڕەگەز پەرستیو ناسیۆنالیستیی کوێرانەو دوژمنی یەکێتیی زەحمەتکێشانن.. هەموو تیۆرییەکی شۆڕشگێڕانە بە هەموو توانایەکەوە هەردووکیان ڕەت ئەکاتەوە.

زایۆنیزم، تەنیا ئایدیۆلۆجییەك نییە، بەڵکو سیستمێکی فرە پەیوەندییانەو چەندان دەزگاو دامەزراوو کۆمەڵە تیۆریو ڕێکخراوی جۆر بەجۆرە.. هەروەها بریتییە لە چەندان ڕێکخراوو سیاسەتو ڕەوشتی سیاسییانەو ئابووریی بۆرجوازییە گەورەکانی جوولەکە، کە لەگەڵ دەزگا ئابووریو کۆمپانیا گەورەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو وڵاتە ئیمپریالیستییەکانی تردا دەستیان تێکەڵکردووەو پێکەوە جۆشیان خواردووە. ناوەڕۆکی بنچینەیی زایۆنیزم، شۆڤینیزمی شەڕ خوازانەو دژی پێشکەوتنە.

زایۆنیزم، لە وڵاتە جۆر بە جۆرەکانی جیهاندا تێ ئەکۆشێت، کرێکارانو زەحمەتکێشانی جوولەکە لە بواری کارو ژیانو چالاکیدا لە کرێکارانو زەحمەتکێشانی جیهان دابڕ بکات، وە ڕێگەیان نادات بەشداریی ڕاپەڕینی کرێکارانەو دیموکراتییانە بکەن. زایۆنیزم بە هەڵگرتنی دروشمی هەڵەی خۆیان "یەکێتیی قازانجی نەتەوەیی جوولەکەکان" ئەیانەوێت ناکۆکیی نێوان کرێکارانو سەرمایەداران، بەرهەمهێنەرو چەوسێنەرەوە جوولەکەکان بشارنەوە. قازانجی زەحمەتکێشە جوولەکەکان بکەن بە قوربانی لە پێناوی قازانجی بۆرجوازییە گەورەو دەوڵەمەندەکانی جوولەکەدا.

ئیمپریالیزمی جیهانی سوودێکی زۆر لەو پیلانە دژ بە نەتەوایەتییانەو هەڵوێستی دژی ئازادیخوازانەو سۆشیالیزمەی زایۆنیزمەکان وەرئەگرێت. کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێشی جوولەکە بە پێی نەخشەی دوژمنانەو دژی خەڵکی خۆیان هەڵ ئەخەڵەتێنن.

خاڵی هاوتای زایۆنیزم، ئانتی سیمیتیزمە "ئانتی واتا دژ، سمیپ بە مانا سامی" یە –ئەو ڕەگەزەیە کە جوولەکەکان ئەچنەوە سەری– ڕەوشتێکی دوژمنانەیە بەرامبەر بە جوولەکە، هەموو مەسەلەیەکی چینایەتیو کۆمەڵایەتی ئەداتە لاوە.. ئانتی سمیتیزم لە هەموو لایەك وەکو چەکێکی دووبەرەکی نانەوەو لادان لە واقیعو لادانی زەحمەتکێشان لەسەر ڕێبازی مەسەلە واقیعیو سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان بەکارهێنراوە. ئەوەتا بە شێوەی نامرۆڤانەو کوشتاری دەستە جەمعیو ئاوارەکردنی خەڵك گەشەی کردووە. ئانتی سمیتیزم هەر وەکو زایۆنیزم تەنیا قازانجی چینە چەوسێنەرەکانو هێزە کۆنە پەرستەکانی ئەوێتو ئەیان پارێزێت، کە لەم ڕێگەیەوە زیانێکی زۆر بە ڕاپەڕینی چینایەتیانەو یەکێتیی کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێش ئەگەیەنێت.

**★ژێرخان و سەرخان**

ژێرخان یان پایە.. بیری پێشکەوتووانە لە نێوان ئەو کۆمەڵە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی کە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا هەبن، پەیوەندییە ماددیو بەرهەمهێنەرەکان وەکو پەیوەندیی بنچینەییو دیاریکەر ئەزانێت.. ژێر خان، یان پایەی کۆمەڵ بریتییە لە

کۆمەڵێك لەم پەیوەندییە بەرهەمهێنەرانە کە قەوارەی ئابووریی کۆمەڵی لێ پێکدێت. مەبەست لە کۆمەڵێك پەیوەندیی بەرهەمهێنان بریتییە لە شێوەکانی موڵکداریێتیو پەیوەندیی نێوان خەڵکەکان کە لەم شێوەی موڵکداریێتییەدا دەوریان هەیە.. لەگەڵ شێوەکانی دابەشکردنی بەرووبوومدا.

هەموو کۆمەڵێك پایە یان ژێرخانی هەیە، ژێرخان وەکو کۆمەڵێك پەیوەندیی بەرهەمهێنان بەستراوە بە باری هێزە بەرهەمهێنەرەکانەوە.

ژێرخان، ڕۆڵێکی گەورە لە ژیانی کۆمەڵدا ئەگێڕێت، ماوە بۆ ئەوە خۆش ئەکات کە بەرهەمهێنانو دابەشکردنی بەرووبوومە ماددییەکان ڕێکبخرێت. هیچ کەس بە بێ سەقامگیربوونی پەیوەندییە بەرهەمهێنەرەکان ناتوانێت دەست بە کاری بەرهەمهێنەرانە بکاتو لە ئەنجامدا پێداویستییەکانی ژیان دابەش بکات. گۆڕینی هەر سەردەمێکی کۆمەڵایەتی بە سەردەمێکی تر یان بڵێین هەر قۆناغێك بە قۆناغێکی تر واتە گۆڕینی پایە بە مانا ژێرخانە. واتە هێنانە کایەی پەیوەندیی بەرهەمهێنانی تازە.

**سەرخان:**

کە ڕووبیناشی پێ ئەڵێن، بریتییە لە تیۆری سیاسی، ماف، فەلسەفی، ئەخلاقی، هونەری، مەزهەبی، کۆمەڵو ئەو دەزگاو دامەزراوانەی پێیەوە پەیوەندیدارن، لەگەڵ شێوەکانی هۆشیاریی کۆمەڵایەتی. ئەگەر بمانەوێت ژێرخان بە ڕیشە یان ئێسقانی لەشێك دابنێین، ئەو کاتە ئەتوانین سەرخان بە لقو گەڵاو یان گۆشتو پێستی ڕوخساری کۆمەڵ دابنێین.

ئاشکرایە ئەم لێکچوواندنە سادەیە ئەو پەیوەندییە دیالەکتیکییە قووڵە کە سەرخانو ژێرخانی پێکەوە جۆشداوە بە باشی نیشانی ئەدات.

هەر فۆرماسیۆنێکی کۆمەڵایەتی–ئابووری ژێرخانی تایبەتیی خۆیان هەیە، سەرخان لەسەر بنچینەی ئەم کۆمەڵە پەیوەندییە ئابوورییانە دامەزراوە کە لە شێوەی موڵکداریێتیدا پەیدا بووە. سەرخان لە بواری گەشەکردنی کۆمەڵدا ڕۆڵێکی دیار ئەگێڕێت، جگە لەوەی کە لەسەر بنچینەی ژێرخانی ئابووری دامەزراوە.. سەرخان بە هۆی ژێرخانەوە کارێکی کاریگەرانە ئەکاتە سەر گەشەکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان.

## ★سزاریسم, تزاریسم - Czarisme, Tsarisme

سزار، یان تزار، نازناوی ئیمپراتۆری لەناوچووی ڕوسیا بوو لە ساڵی (١٥٤٧–١٩١٨) واتە تاکو دوا قەیسەری وڵاتی ڕوس ئەم نازناوە هەبووە. هەروەها بە پادشای بولگاریشیان وتووە لە ساڵەکانی (١٩٠٨–١٩٤٥). ئەم زاراوەیە بە مانا ڕژێمی حکومەتی قەیسەری ئەگرێتەوە لە هەمان کاتدا بە دەسەڵاتی زۆرداریو ئۆتۆکراسیش وتراوە. ئەم زاراوەیە بە تایبەتی لە دوای کۆتایی یەکەمین شەڕی جیهانییەوە لەناو نووسینی نووسەرە گەورە جیهانییەکاندا هاتووەو باسی لێوە کراوە.

## ★سۆشیالیزم - Socialisme

یەکەمین قۆناغی سەردەمێکی کۆمەڵایەتی–ئابووری–یە، کۆمەڵگەیەکە بە پێی یاسا ماددییەکان گەشەکردنی کۆمەڵ لە جێگەی سیستمی سەرمایەداری جێگیردەکات.

لە سەردەمی سەرمایەداریدا ئابووریی وڵات لەسەر بنچینەی موڵکداریێتیی تایبەتیو خاوەنداریێتیی هۆیەکانی بەرهەمهێنان ئەڕوات، بەڵام لە سۆشیالیزمدا بە پێچەوانەوەیە، ئابووریی وڵات لەسەر بنچینەی موڵکداریێتی دەستە کۆمەڵی هۆیەکانی بەرهەمهێنان دائەمەزرێت. واتا لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا لە جیاتی تاقمێك دەوڵەمەندی خاوەن سەرمایەو خاوەن دەزگاو کارخانەکانو خاوەن هۆیەکانی گواستنەوەو.. زەحمەتکێشان ئەبنە خاوەنی ئەمجۆرە شتانە.

لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا –کەتا ئێستا پێگەیشتووە– ئەتوانین دوو جۆر موڵکداریێتیی دەستەکۆمەڵی دەستنیشان بکەین:

**یەکەم:**

موڵکداریێتیی سەرتاسەریی خەڵك یان دەوڵەت.

**دووەم:**

موڵکداریێتیی دەستەکۆمەڵ یان هەرەوەزییانە یان کیۆپراتیۆیی. لە هەر یەك لەم دوو جۆرە موڵکداریێتییە پەیوەندیی تازەی بەرهەمهێنان کە دەستی هاریکارییانەو هەرەوەزییانەیە بەڕێوەیان ئەبات.

پێویستە ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە لێرەدا باسی موڵکداریێتیی هۆیەکانی بەرهەمهێنان ئەکەین.. ئەگەرنا لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا موڵکداریێتیی تاکە کەسی لە هەندێك هەلومەرجی تایبەتیدا، تەنانەت موڵکداریێتیی هۆیە بچووکەکانی بەرهەمهێنان بە مەرجێك ئەگەر نەبێتە هۆی چەوساندنەوەی خەڵك وەکو خۆی ئەمێنێتەوە.

لە دوای سەردەمێکی دوورو درێژی کۆیلەیەتیو فیودالی "دەرەبەگایەتی"و سەرمایەداری کە لەسەر پایەی چەوساندنەوەی خەڵك دامەزرا بوون، سەردەمی سۆشیالیزم چەوساندنەوەی خەڵکی لەلایەن خەڵکەوە لەناو بردو هەرکەس توانیی لە سنووری یاسای سۆشیالیزمدا بژیو ببێتە خاوەنی بەرهەمی خۆی. لەبەر ئەمەیە گۆڕینی سیستمی سەرمایەداری بە سیستمی سۆشیالیزم بەرزترین پلەو گەورەترین خولی مێژووی گۆڕینی کۆمەڵو پێگەیشتنی کۆمەڵگەی ئادەمیزادە.

ئەم گۆڕینەش لە ئەنجامی سەرکەوتنی شۆڕشی سۆشیالیستیانە ڕوودەدات.. گۆڕین لە سیستمی سەرمایەدارییەوە بۆ سۆشیالیزم کارێکی ئاسانو سەرپێیی نییە، بەڵکو پڕە لە ڕووداوی گرانو ئەرکی قورس. لە سیستمی سۆشیالیزمدا ئابووریی تازە دائەمەزرێت، فەرهەنگی نوێ دێتە کایەوە، ژێرخانی کۆمەڵ لە بنەڕەتەوە ئەگۆڕدرێت. لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا هیچ ناوونیشانێکی چەوساندنەوە لە ئارادا نامێنێت. لە سۆشیالیستیدا چەوساندنەوەی نەتەوایەتیو چینایەتیو ڕەگەزایەتی لە ئارادا نامێنێت، ئازادیو یەکسانیی هەموو خەڵك دابین ئەکرێت.. تا ئەو کاتەی هۆیەکانی بەرهەمهێنان بەدەست کۆمەڵێکی تایبەتییەوە بمێنێتەوەو ئازادیی تاکە کەسو کۆمەڵ لە ئارادا نابێت. تا ئەو کاتەی زەحمەتکێشان بە ناچاری هێزی بازووی خۆیان بفرۆشن ئازادی هەر قسەی سەر زارەکی ئەبێت.

لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان کە پەیوەندییەکی دەستە کۆمەڵیانەیە لەگەڵ خاسیەتی هێزە بەرهەمهێنەرەکاندا کە ئەویش دەستە کۆمەڵییە وەکو یەکن واتە هاوشانن.. ئەم هاوشانییە ئەبێتە هۆی هەرە بنچینەیی بە خێرایی گەشەکردنو بەردەوامیی ئابووری. ژیانی ئابووریی کۆمەڵگەی سۆشیالیستی بە هۆی بەرنامەیەکی هەمەلایەنیانەوە گەشە ئەکاتو پێ ئەگات.

لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لە ئەنجامی لەناوچوونی چینە چەوسێنەرەکان، کۆمەڵگەی سۆشیالیستی لە چینە دۆستەکان، واتە چینی کرێکارو جووتیارو توێژە کۆمەڵایەتییە ڕۆشنبیرەکان پێکدێت.. هەر چەندە ئەو کۆمەڵگەیە زیاتر پێش بکەوێت جیاوازییە بنچینەییەکانی نێوان کاری دەستیو کاری فیکری، نێوان شارو لادێ زۆرتر لەناوئەچن.. لە قۆناغی دووەمی ئەم کۆمەڵگەیەدا، ئەم جیاوازییە بە تەواوی لەناو ئەچن.

کارکردن لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا بنچینەی بەهرەداریو سوود وەرگرتنە لە کۆمەڵ، وە هەر کەس بە پێی کارو توانای کاری بەشی خۆی وەرئەگرێت. سۆشیالیزم لە جیاتی بنچینەکانی سەرمایە بنچینەی کار دائەمەزرێنێت.

گۆڕین لە جیهانی سەرمایەدارییەوە بۆ سۆشیالیزم لە وڵاتە جۆر بەجۆرەکاندا، هەر وڵاتە بە پێی بارودۆخی ئابووریو کۆمەڵایەتیی خۆی ڕوخسارێکی هەیەو لە هەلومەرجی جۆربەجۆری مێژووییدا بە شێوەی هەمە چەشنە بە ئەنجام ئەگات.

سۆشیالیزم، ئاسۆی ڕزگاربوون لە ئیمپریالیزمی نیشانی خەڵك داوە، ڕژێمی کۆمەڵایەتیی تازە بە پشتیوانیی موڵکدارێتیی دەستە کۆمەڵیو بە خاوەن بوونی هۆیەکانی بەرهەمهێنانو دەسەڵاتدارێتیی زەحمەتکێشانەوە ئەتوانێت بەرنامەیەکی ئابووری بێ ئاڵۆزی بە قازانجی تەواوی خەڵك دابمەزرێنێت. مافی کۆمەڵایەتیو سیاسیی زەحمەتکێشان مسۆگەر بکات. ئەوە سەلمێندراوە کە تەنیا سۆشیالیزم ئەتوانێت هەموو مەسەلە بنچینەییەکانو گیروگرفتە سەرەکییەکانی ژیانی ئادەمیزاد چارەسەر بکات..

سۆشیالیزم لە وشەی (Social)ی فەرەنسییەوە وەرگیراوە کە بە مانا "دەستە کۆمەڵی" ئەگرێتەوە. ئەم زاراوەیە لە گەلێك فەرهەنگدا بەدی ئەکرێت، بە تایبەتی لە فەرهەنگی ئاکسفۆردی ئینگلیزیدا ئەویش ئەم مانایە ئەگرێتەوە.. سۆشیالیزم، تیۆری یان سیاسەتێکە کە ئەیەوێت موڵکدارێتیی دەستە کۆمەڵی پەیدا بێتو کۆمەڵ ببێتە خاوەنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان. سەرمایەو زەویوزارو کەلوپەلو هەموو شتێکی تر ببێتە موڵکی تایبەتیی کۆمەڵو بە قازانجی کۆمەڵ کاریان پێ بکرێت..

سۆشیالیزم لەبەر باری سەرنجی مێژووییدا ڕاپەڕینێکە دژی ئەندیڤیدوالیزمو لیبرالیزم.. سۆشیالیزم بەرهەمی شۆڕشی پیشەسازییە، چونکە شۆڕشی پیشەسازی دوو چینی تازەی گەورەی وەکو سەرمایەدارانو کرێکاران لە کۆمەڵدا ئەخوڵقێنێت.. هەروەها ئایدیۆلۆجیی تایبەتی چینی کرێکاریش سۆشیالیزم دێنێتە کایەوە. کەوابوو سۆشیالیزم ئەو ئایدیۆلۆجییەیە کە لە ئەنجامی شۆڕشی پیشەسازیو بە قازانجی پرۆلیتاریا ئەبێت.

زاراوەی سۆشیالیست یەکەمجار لە ساڵی (١٨٢٧)دا بە لایەنگرانی "رابرت ئاون" یان ئەوت، وە سۆشیالیزم لە ساڵی (١٨٣٢) لە بڵاوکراوەکەی ئۆرگانی لایەنگرانی "سان سیمۆن" دا بە مانای بیروباوەڕی سان سیمۆن وتراوە. دوای ئەوەش لە فەرەنسەو بەریتانیاو ئەڵەمانو ئەمەریکادا ئەم زاراوەیە بە زۆری لە چاپەمەنییەکاندا بڵاو ئەکرایەوە..

یەکەمین دەستەی سۆشیالیست ئەو کەسانە بوون کە باوەڕیان بە سیستمی کۆمەڵایەتی هەبوو، هەموویان لەسەر یەك خاڵی سەرەکی ڕێککەوتبوون، ئەویش دوژمنایەتی کردنی ئەندیڤیدۆ ئالیستی بوو..

**★سانسۆر - Censeur**

لە زمانی لاتینیدا بە مانا دەست خستنە ناو کاروبارەوە هاتووە، قەدەغەکردن بە هۆی دەسەڵاتەوە سیاسی بێت یان ئاینی یان هەر جۆرێکی تر.. سانسۆر لە بواری سیاسیو تیۆکراتیدا ئەکرێ، بەڵام ئێستا بە زۆری لە بواری چاپەمەنیدا ئەکرێ، لە سەدەی شازدەیەمی زاینیدا کڵێسای کاتولیك یەکەمین نموونەی نووسراوە قەدەغەکراوەکانی بڵاوکردەوە، پرۆتستانتەکان لە بواری چارەسەرکردنی ئاینیانەدا سوودیان لە سانسۆر وەرئەگرت.

**سانسۆر لە ڕۆژگاری ئێستای ئێمەدا بەدوو جۆر کاری پێ ئەکرا:**

**یەکەم:**

سانسۆری قەدەغەکردن.

**دووەم:**

سانسۆری سزادان.

جیاوازیی نێوان ئەم دوو شێوازە ئەوەیە، یەکەمیان بەر لە بڵاوبوونەوەیەو دووەمیان دوای بڵاوبوونەوە. هەندێك جاریش لەسەر ڕێککەوتنی نێوان نووسەرەکان ئەبێت کە هەموویان ڕێك ئەکەون لەسەر بابەتێك کە بڵاونەکرێتەوە، ئەویش لەبەر ئەوەیە نەوەك زیان بە ئاسایشی وڵات بگەیەنێت.

لە کۆمەڵگەی دیموکراتییانەدا سانسۆر هێمنانەو بۆ قازانجی خەڵکە، تەنیا لە کاتی شەڕو ئاژاوەدا توندو تیژ ئەبێت.

## ★سانترالیسمی دیموکراتی - Centralisme Democratique

لە ڕوی زمانەوە ئەم زاراوەیە لە دوو وشە پێکهاتووە، سانترالیزم واتە ناوەندێتی "مەرکەزییەت"، دیموکراتیك سیفەتی وشەی دیموکراتیەیە.. هەندێك جاریش پێی ئەوترێت "مەرکەزییەتی دیموکراتی".. سانترالیزمی دیموکراتیك ڕابەرایەتیی دەستە کۆمەڵییە لەناو ڕێکخستنی ڕێکخراوە تازەکاندا، سانترالیزمی دیموکراتی پەیوەندیی نێوان ڕابەرایەتیو ئەندامانی ڕێکخراوەکە، نێوان ئۆرگانەکانی سەرەوەو خوارەوە، نێوان ئەندامانی ڕێکخراو، لە خۆیا دەرئەخات..

مەفهوومی سانترالیزم بریتییە لە پێکهێنانی ڕێکخراوەکانی هەر حزبێك لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە.. دیموکراتیو مەرکەزییەت دوو ڕووی یەك شتن، لە ژیانی ناوخۆی ڕێکخراودا.. لە زۆر ڕێکخراوی نا کرێکاریدا لەم بارەیەوە قسەکراوە، بەڵام هیچ ڕێکخراوێکی بۆرجوازی یان دەرباری سەرنجی ئەم مەسەلەیە نادەنو ڕەفتاری پێ ناکەن. ڕێکخراوێکی کرێکاری، ڕێکخراوێکی شێواز تازە کە لەسەر بنچینەی تیۆرییەکی شۆڕشگێڕانە بڕوات هەرگیز ناتوانێت دوور لەم ڕێبازە چالاکییەکانی خۆی یەکبخات.. ڕێکخراوی چینی کرێکار ئۆرگانیزمێکی گەشەکردووە وەکو هەر دیاردەیەکی تر، لە ئەنجامی ناکۆکییەکانی ناو خۆیدا گەشە ئەکات.. ڕێکخراو لەسەر بنچینەی ناکۆکییە دەروونییەکانی خۆی گەشە ئەکات. گۆڕینی هەر ڕێکخراوێك بە بێ ناکۆکیی ناوخۆ گۆڕانێکی نا دیالەکتیکی یانەیەو لە جیهانی واقیع بە دوورە.

<u>سانترالیسم ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەگرێتەوە:</u>

*١-ئەو ڕێکخراوە بەرنامەیەکی یەکگرتووی هەبێت.*

*٢-ئۆرگانێکی باڵا ڕابەریی بکات کە پێی ئەڵێن "کۆمیتەی ناوەندی" و ئەویش لە کۆنگرەیەکەوە بۆ کۆنگرەیەکی تر هەڵبژێردرابێت.*

*٣-هەموو ئۆرگانەکانی ڕێکخراوەکە سەر بەناوەند "مەرکەز" بن، ئۆرگانەکانی خوارەوە سەر بە ئۆرگانەکانی سەرەوە بنو کەمایەتی سەر بە زۆرایەتی بێت.*

*٤-ڕێکخستنێکی هۆشیار دەسەڵاتدار بێت تیایدا، کە شێوازێکی نوێ بۆ هەموو ئەندامان وەکو یەك دیاری بکات.*

<u>دیموکراسیش ئەم خاڵانە ئەگرێتەوە:</u>

*١-هەموو ئۆرگانەکان لە سەرەوە تا خوارەوە بە پێی هەڵبژاردن بێت.*

*٢-هەر ئۆرگانێکی ڕابەری، ئەرکی ڕاپۆرتدانی لەسەر ئەو ئۆرگانەی لە ئەستۆدایە کە هەڵیبژاردووە.*

*٣-شیکردنەوەو باسکردنی هەموو مەسەلە سیاسیو ڕێکخستنەکان بە پێی بڕیاری باڵا مافی هەموو ئەندامێك بێت.*

## ★سەرمایەداری - Capitalisme

سەرمایەداری ئەو قۆناغە پێگەیشتووە کۆمەڵایەتی-ئابوورییەیە کە جێگەی سیستمی کۆمەڵایەتیی فیوداڵیی گرتووەتەوە.. سەرمایەداری دوا ڕژێمێکە کە لەسەر بنچینەی چەوساندنەوە ئەڕوات، پایەی لەسەر موڵکداریتیی تایبەتیو خاوەن هۆیەکانی بەرهەمهێنانو چەوساندنەوە دامەزراوە.

لە قۆناغی لەناوچوونی فیوداڵیزمدا شێوەکانی بەرهەمهێنان لە شێوەی ساکارەوە ئەگۆڕدرێت بۆ شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریو لە قۆناغی سەرمایەداریدا جۆری بەرهەمهێنان گەشە ئەکاتو هەموو هۆیەکانی بەرهەمهێنان ئەبێتە موڵکی سەرمایەداران.

هێزی کار لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا وەکو کەلوپەلی لێ دێت، قۆناغی سەرەتایی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری پێی ئەڵێن هاریکاریی سادەی سەرمایەداری[1]، کە شێوەیەکی کاری هەرەوەزییانەیەو سەرمایەداران کۆمەڵێك کرێکار پێکەوە ئەخەنە کار تاکو پێکەوە کارێك بە ئەنجام بگەیەنن، قۆناغی دوای ئەوە پێی ئەوترێت -مانوفاکتۆر- کە لە ڕوی زمانەوە بە مانای کارگە دەستییەکانە.. ئەو جۆرە بەرهەمهێنانە سەرمایەدارییەیە کە لەسەر پایەی سیستمی کارو تەکنیکی پیشەکاران دائەمەزرێت، بۆ نموونە کۆمەڵێك کرێکاری پیشەیی لە کارگەیەکدا هەر یەکە کارێکی تایبەتی ئەکەن، بەڵام بە هەموویان جۆرە کەلوپەلێك بەرهەمدێنن، یان هەر کرێکارێك بەشێك لە دروستکردنی بەرهەمێك تەواو ئەکات.

مانوفاکتۆرەکان هەلومەرجی لەبار بۆ گۆڕینی جۆری بەرهەمهێنانی دەستی بەجۆری بەرهەمهێنانی چەرخ ئامادە ئەکەن، بەم جۆرە ئەبێتە خاڵی ناوەندیی نێوان بەرهەمە دەستییەکانو سنعەتی گەورەی تەکنیكو مەکانیزە..

لە ڕووی مێژووییەوە گەشەکردنی هۆیەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەستی پێکردووە، بەڵام لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمو سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم کە بەرهەمهێنانی چەرخ پەیدا بوو، کارخانەی تەکنیکیو

---

١-Cooperation

سنعەتی چەرخ لە جیاتی مانوفاکتۆرەکانو کارگە پیشە دەستییەکان دامەزران. چەندان دەزگاو دامەزراوی گەورەی سەرمایەداریی کشتوکاڵی پێکهات.. کە کرێکاری کشتوکاڵیی کرێگرتە لەگەڵ هاوچەرخو مەکینەی کشتوکاڵیدا کاری تێدا ئەکرد.

### ★سکتاریسم-Sectarisme

واتا دوورە پەرێز وەستان لە کۆمەڵانی خەڵك، گۆشەگیری، ئەم زاراوەیە لە وشەی "سکت" وەرگیراوە.. بە مانای دەستە یان کۆمەڵی بچووك وەیان تیپ ئەگرێتەوە کە دەرگایان لە رووی خۆیان داخستبێتو پەیوەندییان لەگەڵ خەڵکدا نەبێت..

سکتاریزم، لە مانای سیاسیدا جۆرە ئەپۆرتۆنیزمێکی چەپرەوانەیە لەناو راپەرینی کرێکاراندا، سیاسەتێکە ئەبێتە هۆی دوورە پەرێزکردنی رێکخراوە شۆرشگێرەکان لە کۆمەڵانی خەڵك.. سروشتی سیاسی سکتاریزم لە خەباتی چینایەتیو کۆمەڵایەتیدا یان لە پێش داخوازییەکانی کۆمەڵەوەیە، یان لە دوای ئەوانەوە ئەڕوات.. سکتاریستەکان لە ئاستی جیهانیدا شێوازی پەیوەندیو راپەرینی جەماوەرییانەی سێ هێزی گەورەی دژی ئیمپریالیزمیان ناوێت وەکو:

*١-ولاتە سۆشیالیستییەکان.*

*٢-راپەرینی ئازادیخوازانەی گەلی.*

*٣-راپەرینی کرێکاران لە ولاتە سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکاندا.*

سکتاریزم زایندەی وەستانو دۆگماتیزمو چەپرەوییە لە پێستی خۆیا خۆی ئەپێچێتەوەو پەیوەندیی لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکدا ئەپچرێو دەست ئەکات بە کۆنەپارێزیو کاری لادەرانە لە شێوازی تیۆریی شۆرشگێرانەو فەرامۆشکردنی دیالەکتیكو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان.

سکتاریزم، لە کۆمەڵدا رێکخراوەکانی چینی کرێکار لە چینو توێژە یەکگرتووەکانی تری کۆمەڵ جیا ئەکاتەوە، سکتاریزم جۆرێکە لە رواڵەت بینیی لە کاری سیاسییانەدا زۆربە ئەبەستێت بە کەمایەتییەوە.. تاك ئەخاتە پێش کۆمەڵەوە، قازانجی تاکە کەسو کۆمەڵی تایبەتی ئەخاتە پێش قازانجی هەموو کۆمەڵەوە.. بەربەرەکانێی سکتاریزم یەکێکە لە ئەرکە گشتییەکانی سەرشانی رێکخراوە شۆرشگێرییەکان لەناو تێکرای کۆمەڵدا.

### ★سەندیکا - Syndicat

ئەم زاراوەیە بە مانا رێکخراوی پیشەیی چینی کرێکارو زەحمەتکێشانی تر ئەگرێتەوە.. کە پێی ئەڵێن "نیقابە".. نەقابەکان لە ئەنجامی راپەرینی کرێکاران لە پێناوی داکۆکیکردن لەسەر قازانجو باشکردنی باری گوزەرانو زەمینەی ژیانی ئابووریان پەیدا بووە.

یەکەمین نەقابە "تریدیونیون" لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەمدا لە بەریتانیا -کە لەو کاتەدا یەکەمین تێکشکانی ولاتە سەرمایەدارییەکان بوو- دامەزراوە. لە فەرەنسەش لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا، لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا، لە ئەڵمانیا لە ناوەراستی سەدەی رابوردوودا نەقابەکانی کرێکاران دامەزراون.

لە کاتی گەشەکردنی قۆناغەکانی سەرمایەداریدا، کاتێك کە هێشتا گۆرینی سۆشیالیستییانە نەهاتبووە کایەوە، نەقابەکان بەرە بەرە بوونە رێکخراوی هەمیشەییو کەم تا زۆر بە پێی کاتو شوێن ئەهمییەتیان پەیدا کردو بەهێز بوون. لەو کاتەدا هێشتا رێکخراوێکی سیاسیی کرێکاران دانەمەزرابوو. نەقابەکان رێبازێکی سیاسیو ئاشکرایان نەبوو، زۆربەیان بە پێی دەستووری نەقابەکانی بەریتانیا واتە "تریدیونیون"ەکان کاریان ئەکردو هەموو چالاکییەکانیان بریتی بوو لە پاراستنی قازانجی خۆیان.

ئێستا لە گەلێك لە ولاتانی رۆژئاوادا نەقابەکان بە دەست کەسانی راستڕەوو ئەریستۆکراسیی کرێکارانەوەن، بەلام لە زۆربەی ولاتە سەرمایەدارییەکاندا نەقابەی چالاكو کارگوزاری تر هەیە کە تەنیا لە پێناوی قازانجی تایبەتیی خۆیاندا -واتە کرێکاراندا- تێ ناکۆشن، بەڵکو چالاکیی سیاسیی هەمەجۆرەی خۆیان لە دژی سیستمی سەرمایەداری ئەنوێنن.

ئەم نەقابانە داکۆکی لەسەر قازانجی زەحمەتکێشان، لە پێناوی دیموکراتیدا، مافە پیشەییەکان، ئازادیی نەتەوایەتی، دژی چەوساندنەوەی نەتەوایەتیو جیاوازیی رەگەزایەتیو چەوساندنەوە خەبات ئەکەن.. نەقابە پێشکەوتووەکانی سەرتاسەریی جیهان لە پێناوی یەکێتیی زەحمەتکێشانی ولاتە جۆربەجۆرەکاندا تێ ئەکۆشن. فیدراسیۆنی نەقابەکانی جیهان نموونەی ئەم یەکێتییە جیهانییەیە.

سەندیکا، مانایەکی تریش ئەگرێتەوە، وەکو ئینحیساری سەرمایەدار، کە بە پێی بریارو رێککەوتنی دەزگا ئینحیسارییەکان بۆ پێکەوە فرۆشتنی کەلوپەلو کرینی کەرەسەی خاو دائەمەزرێنو نرخێکی یەك بابەتی لەسەر کەلوپەلو کەرەسە خاوەکان دائەنێن.

### ★ستراتیج و تاکتیک - Strategieet, Tactigue

زاراوەی ستراتیجو تاکتیك جگە لە بواری سیاسیو حزبی.. لە کاروباری سەربازی، دیپلۆماتیك وە یان کاروباری ئابووریو.. بەکار ئەهێنرێت. لە کاروباری سەربازیدا یەکەمیان بە مانای ئامانجو نەخشەی دوورو کۆمەڵە کردارێکی فراوانو تەواو بۆ سەرکەوتن لە جەنگدا.. دووەمیان بە مانای ئامانجی نزیك، کرداری یەك لە دوای یەك، چالاکیی ناوچەیی بۆ سەرکەوتن لە جەنگێکی تایبەتیدا ناو ئەبرێت.

بەڵام ئێمە لەم باسەدا مەبەستمان لە ستراتیجو تاکتیك ڕێکخراوە شۆڕشگێڕییە کرێکارییەکانە لەو ڕاپەڕینانەدا کە لە پێناوی ڕزگارکردنی کۆمەڵایەتیو نەتەوایەتیدا ئەیکەن.. لەم بوارەدا ستراتیجو تاکتیك بریتییە لە زانستی ڕابەریکردنی ڕاپەڕینی چینایەتیی پرۆلیتاریاو هەموو چینە زەحمەتکێشەکان.

ستراتیج بریتییە لە دیاریکردنی لایەنی ئەصڵیی ڕاپەڕینی چینایەتیی پرۆلیتاریا، دیاریکردنی ڕێکخستنو تایبەتییەکانی لەشکری سیاسی بە ڕابەرایەتیی چینی پرۆلیتاریا لە قۆناغێکی دیاریکراوی شۆڕشدا.. دانانی نەخشەی پێویست بۆ سوود وەرگرتن لە کەرەسەو تەقەمەنیی هێزە بنچینەییو لقییەکانی شۆڕش.. دانانی نەخشەی یەکگرتنی هێزەکان لە ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەداو کۆکردنەوەی ئەم هێزانە لە دەوری چینی پرۆلیتاریا. ستراتیجی هەر ڕێکخراوێك لە ماوەی قۆناغێکی دیاریکراودا کە سەرگەرمی خەباتی ئازادیخوازانە بێت، واتە لە ماوەی سەرتاسەریی تەمەنی شۆڕشدا بە بێ گۆڕان وەکو خۆی ئەمێنێتەوە.

★ستالینیزم - Stalinisme

ئەم زاراوەیە تایبەتە بە یوسف فیساریۆ نوفیچ ستالین، ١٨٧٩-١٩٥٣ سەرەك وەزیرو فەرماندەی گشت هێزی چەکدارو سکرتێری گشتیی حزبی کۆمۆنیستو دیکتاتۆری پێشووی سۆڤێت.

ستالینیزم ئایدیۆلۆجییەکی تایبەتی نییە، بەڵکو بەو کۆمەڵە کردارە ئەوترێت کە لە سەردەمی حوکمڕانیی ستالیندا لە ڕوسیا دا کراوە. کۆمۆنیستەکان لە سەردەمی ژیانی ستالیندا ئەویان بە گەورەترین لێکدەرەوەی فەلسەفەو باڵاترین سەرچاوەی تیۆریی شۆڕشگێڕانە دائەنا لە کۆڕی ڕاپەڕینی نێونەتەوەیی جیهانیدا.

لە دوای مردنی ستالینو خۆ نیشاندان لە دژی کردەوەکانی ستالینیزمیان بەلادەر دائەنا.. لەو کاتە بە دواوە ئیتر وەکو سەرچاوەیەکی تیۆری تەماشا نەئەکرا.. ستالینیزم بە کرداری درندانەو ڕژێمی پۆلیسیو تاکە کەس پەرستیو دیکتاتۆر دائەنرا.

لە ڕاپەڕینی نێونەتەوەییدا یوگۆسلاڤیا یەکەمین وڵاتێك بوو کە بەر لە هەر وڵاتێکی تر دژی ڕێبازی ستالینیزم وەستاو ئەوی بە لادەر دائەنا[1].

★سیاسەت - Diplomacy

**یەکەم:**

ئەو مەبەستو ئامانجانەیە کە چینێکی کۆمەڵایەتی لە پێناوی سەرکەوتنی ڕاپەڕینو پاراستنی دەستکەوتو قازانجەکانیا ئەیگرێتە بەر.

**دووەم:**

شێوازی پاراستنی ئەو دەستکەوتو قازانجانەیە.. لە پلەی یەکەمدا بریتییە لە کاروباری دەوڵەتی، ڕێبازی دەوڵەتو بەڕێوەبردنی وڵات، دیاریکردنی شێوەکانی ئەرکو ناوەڕۆکی چالاکییەکانی دەوڵەت.

سیاسەت، ڕاپەڕینی چینایەتییانە نیشان ئەدات، باری ئابووریی هەر چینێك سیاسەتی ئەو چینە دیاری ئەکات. بە پێی قسەی تیۆری زانەکان "سیاسەت ڕوخساری کۆڵەکەی ئابوورییە".

**سیاسەت دوو شێوەیە:**

*١-سیاسەتی ناوخۆ.*

*٢-سیاسەتی دەرەوە.*

پەیوەندیی نێوان چینەکانو نێوان نەتەوەکان لە ناوخۆی وڵاتێکدا بەشێکە لە سیاسەتی ناوخۆ. پەیوەندیی نێوان دەوڵەتەکانو نێوان خەڵکەکان لە بواری نێونەتەوەییدا ئەویش بەشەکەی تری سیاسەتە، کە سیاسەتی دەرەوەی پێ ئەڵێن.

سیاسەتی ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکان لەسەر پایەو بنچینەی تیۆری شۆڕشگێڕانەو ناسینی تەواوی یاساکانی گەشەکردنی کۆمەڵ دامەزراوەو بە قازانجی کۆمەڵ ئەڕوات. بۆیە پێویستە هەموو ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕانە جگە لە دیاریکردنی سیاسەتی دروستو کارکردنو لەسەر ڕۆیشتنی.. پێویستە بە شێوەیەکی تایبەتی سەرنجی پەروەردەکردنی سیاسییانەی کۆمەڵانی خەڵك بدات، هەر وەکو چۆن سەرنجی کاروباری ڕێکخستنو دامەزراندنو پەروەردەی ڕیزەکانی خۆی ئەدات.

★سیستمی هەڵبژاردن - Election System

سیستمی هەڵبژاردن ئەوەیە کە لە وڵاتدا بە پێی یاساو نەریتی تایبەتی، بە پێی دەنگدان بڕیار لەسەر هەڵبژاردنی ئۆرگانە هەڵبژێردراوەکانی وڵاتو دیاریکردنی ئەنجامی دەنگدانەکان ئەدرێ.. سیستمی هەڵبژاردن مەرجو مافو ئەرکەکانی هەڵبژێردراوەکانو ئەوانەی دەنگ بۆ هەڵبژاردنەکە ئەدەن دەستنیشان ئەکات.

لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا، لەگەڵ ئەو هەموو میلاکانەی چینایەتیو داراییو نەتەوەییو ڕەگەزیو جنسیو ئەمجۆرە شتانە کە هەیە کەچی بەشێکی زۆری خەڵکی زەحمەتکێش لە دەنگدانو خۆ پاڵاوتن بۆ هەڵبژاردن بێبەشن. لەو وڵاتانەدا سیستمی هەڵبژاردن بە جۆرێك ڕێك ئەخرێت کە تا ئەوەندەی بۆیان بکرێت دەسەڵاتی چینی فەرمانڕەوا بپارێزرێت.

---

١-باسەکە لەوە درێژترە کە نووسراوە، بەڵام ئێمە ئەوەندەمان مەبەست بوو کە لێرەدا نووسیمان-وەرگێڕ.

هەڵبژاردن ڕاستەوخۆ ئەبێت، یان ناڕاستەوخۆ ئەبێت، لە جۆری ڕاستەوخۆ یاندا ئەوانەی دەنگ ئەدەن ڕاستەوخۆ بەشداریی هەڵبژاردنی ئۆرگانی مەبەست ئەکەن، بەڵام لە هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆدا دەنگدەرەکان لە سەرەتاوە چەند کۆمەڵێك هەڵ ئەبژێرن‌و ئینجا ئەوانیش بە پێی دەنگ ئۆرگانەکان دیاری ئەکەن‌و هەڵی ئەبژێرن. هەروەها هەڵبژاردن بە نهێنی‌و بە ئاشکراش ئەکرێ..

***لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا دوو سیستمی هەڵبژاردن بەکاردێنن:***

*١–سیستمی نیسبەتکاریی دەنگەکان–Proportionne*

*٢–سیستمی زۆربەی دەنگەکان–Mayoritaire*

لە سیستمی نیسبەتکاریی دەنگەکاندا کورسییەکانی پەرلەمان بە پێی نیسبەتی دەنگی کۆمەڵە بەشداربووەکان دابەش ئەکرێت، بەڵام لە سیستمی زۆربەی دەنگەکاندا ئەو پاڵێوراوانە هەڵ ئەبژێردرێن کە دەنگی زۆریان بەدەستهێناوە. هەر پاڵێوراوێك دەنگی کەم بێنێت لە پەرلەمان بێبەش ئەبێت. لەبەر ئەوە سیستمی نیسبەتکاریی دەنگەکان لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا سیستمێکی دیموکراتییانە ترە.

**★شۆڤینیزم - Chauvinisme**

ئەمە سیاسەتێکی کۆنەپەرستانەیە، ئامانجی ئەوەیە گەلان‌و خەڵکی وڵاتانی تر بکێشێتە ژێردەسەڵات‌و ڕکێفی خۆیەوە‌و ئاگری ناکۆکی‌و دوژمنایەتیکردنی نەتەوەکان بکاتەوە‌و ڕێزی نەتەوەکەی خۆی بدات بەسەر هەموو نەتەوەکانی تری جیهاندا.. قازانجی نەتەوەکەی خۆی لە پێش قازانجی هەموو نەتەوەیەکی ترەوە دابنێت.. ئەمە سیاسەتێکی بۆرجوازییانەیە کە پرپەتی لە میکرۆبی ڕەگەز پەرستێتی.

شۆڤینییەت هیچ ڕێزێکی نیشتمان پەروەری ناگرێت کە یەکێکە لە ئیحساسە هەرە پیرۆزەکانی ئادەمیزاد. دوژمنایەتیی نەتەوەکانی تر ئەکات، هەموو ئامانج‌و تێکۆشانێکی زەحمەتکێشانی نەتەوەکانی تر ئەخاتە ژێر پێیەوە.. لە جیاتی هاریکاریی نێوان گەلان‌و پێشکەوتنی کۆمەڵانی خەڵکی تر، تەنیا پێشکەوتنی نەتەوەکەی خۆی ئەپارێزێت.. ئیستیعمار‌و کۆنەپەرستی‌و داگیرکاران سوود لە هەڵوێستی سیاسەتی شۆڤینیستانە وەرئەگرن‌و بە پێی ئەو سیاسەتە ناکۆکی لە نێوان نەتەوەکاندا ئەنێنەوە. هیچ پەیوەندییەکی نیشتمانییانە‌و سۆزی نیشتمان پەروەرییانە نییە، بە پێی تەعەصوبی کوێرانەی خۆیان دوژمنایەتیی هەموو نەتەوەکانی تر ئەکەن.

شۆڤینییەت هەوڵ ئەدات ڕێگە لە پێشکەوتنی نەتەوەکانی تر بگرێت‌و بە هەر جۆرێك بێت دیل‌و ژێردەستەیان بکات. ڕقی لە سەربەخۆیی‌و دەسەڵاتی خۆیی نەتەوەکانی تر ئەبێتەوە.. پشتگیری‌و هانی ستەمی نەتەوایەتی ئەدات بۆ یەکتر چەوساندنەوە‌و زەوتکردنی دەسەڵاتی سەربەخۆیی یەکتر.

دەزگا دەسەڵاتدارە کۆنەپەرستەکان گەلێك سوود لەم سیاسەتە چەوتە وەر ئەگرن. فاشیستەکانیش ئەم سیاسەتەیان ئەکردە گورزی دەستی خۆیان‌و ئەیکەن. ئێستاش ئیمپریالیستەکان بە هۆی ئەم سیاسەتەوە ئاگری ناکۆکی نانەوە‌و دووبەرەکایەتیی نێوان نەتەوەکانی جیهانی خۆش ئەکەن.

شۆڤینیستەکان بەم سیاسەتەیان خزمەتێکی گەورە بە ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستانی جیهانی ئەکەن.

**★عەینی و ÌäåÐ - Objectif, Subjectif**

**عەینی- Objectif**

بەوە ئەڵێن کە لە دەرەوەی هۆش‌و ئاگاو هەستی مرۆڤدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەیە. بە واتایەکی تر ئەوەیە کە پەیوەندیی بە دەروون‌و بیرو هۆش‌و شوناسایی مرۆڤەوە نییە.

**ÌäåÐ - Subjectif**

واتە ئەو شتەی کە لە ناو هەستو دەروونی مرۆڤدا هەیە‌و بە پێی تیۆری ماتەریالیستی تیشکدانەوەی جیهانی عەینییە. هەرچەندە لە زۆر کات‌و شوێن‌و باس‌و بابەتی هەمە جۆرەی کۆمەڵایەتییانە‌و فەلسەفییانەدا ئەم دوو وشەیە بە چەندان جۆر مانایان لێك ئەدرێتەوە، بەڵام لێرەدا، لەم ڕوونکردنەوەیەدا ماهییەتی ئایدیالیستانەی ئەم تیۆرییە بە ئاشکرا دەر ئەکەوێت.

**★فابینیزم - Fabianism**

ڕاپەڕینێکی سۆشیالیستانەیە کە لە بەریتانیا ڕوویدا، لایەنگرانی ئەم ڕاپەڕینە لە ساڵی (١٨٨٤)دا لە "زانکۆی فابین" یەکیان گرت‌و سیدنی وب، جۆرج برناردشۆ، گراهام والاس، هـ.ج.والز لە سەرکردەکانی ئەم ڕاپەڕینە بوون. فابینیزم ڕاپەڕینێکی ئاشتیخوازانەیە، ناوی خۆیان لە ناوی "فابیۆس"ی سەرداری ڕۆم وەرگرتووە، کە بە هێمنی‌و لەسەرخۆیی‌و شەڕو کشانە دواوە "هانیباڵ"ی سەرداری "کارتاج" یان شکاند. برناردشۆ فابییەکانی تر لایەنگری تیۆریی "ستیوارت میل"و "هنری جۆرج" بوون.

لە دوای دامەزراندنی حزبی کرێکاران، چوونە ناو حزبەکەوە، بەڵام قەوارەی بوونی خۆیان نەدۆڕاند، وەکو کۆمەڵە ڕۆشنبیرێك لەناو ئەو ڕێکخراوەدا کەوتنە چالاکی نواندنی ڕۆشنبیرانە.

**★فاشیزم - Fascisme**

مانـای زانسـتییانەی ئـەم زاراوەیـە بریتییە لە ڕژێمێکی دیکتاتۆرییانە کە لەسەر زۆرداریو کوشتنوملهوڕی دامەزرابێت، کە بە هۆی کۆنەپەرست ترینو دەستدرێژکار ترین شێوەی ئیمپریالیستەوە سەقامگیربێت.

سـەرمایەدارە چاوچنۆکەکان پشـتگیریی لـە فاشـیزم ئەکـەن بـۆ ئـەوەی ڕژێمـی سـەرمایەداریی خۆیـانی پـێ بـپارێزن. حکومەتـە فاشیسـتەکان هـەموو مافـە ئـازادیو دیموکراتیـیەکانی وڵات لـەناو ئەبەنو سیاسەتی پیاوکوژانەی خۆیان ئەبەستن بە پاشکۆی نەتەوە پەرستیی کوێرانەو ڕەگەز پەرستییەوە.

فاشـیزم لـەناو گێژاوی گشتیی سەرمایەداریدا دێتە کایەوە، لەو قۆناغەدا کە بەربەرەکانێی نێوان پرۆلیتاریاو بۆرجوازی توندوتیژ تر ئەبێت، بۆرجـوازی توانـای ئـەوەی نامێنێت لە ڕێگەی پەرلەمانەوە حوکمو دەسەڵاتی خۆی بپارێزێت پەنا ئەباتە بەر تیرۆرو تۆقاندنو سـەرکوتکردنی خوێناوییانەی هەموو جۆرە ڕاپەڕینێکی کریکاریو دیموکراتی. هەروەها دەست ئەکات بە بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی خەڵك خەڵەتێنەرانە.

فاشـیزم بە پێی حوکمی سیاسەتی ناوخۆیی خۆی هەموو ڕێکخراوە پێشکەوتنخوازەکانو نەقابەو ئازادییە دیموکراتییەکان قەدەغە ئەکاتو دەزگاکانی دەوڵەت ئەکات بە دەزگاو حوکمی سەربازیو دەست بەسەر هەموو ژیانی کۆمەڵایەتیی وڵاتدا ئەگرێت.

فاشـیزم بـۆ ئـەوەی مەبەسـتەکانی خۆی بهێنێتە دی سوود لە تاقمو دەستەو کۆمەڵە دەست وەشێنەرەکانو پیاو کوژو عونسوری وەکـو (S-S)ەکـانی ئەڵەمانـیای هیـتلەریو کـراس ڕەشـەکانی ئیتالیای موسولینی وەرئەگرێت. بنچینەی ئایدیۆلۆجیی فاشیزم لەسەر ڕەگەز پەرستیو شۆڤینیستیو ئەمجۆرە تیۆرییە کۆنەپەرستانانە دامەزراوە.

لـە ڕووی مێژوویـیەوە فاشـیزم یەکـەمجار لـە سـاڵی (١٩١٩)دا لـە ئیتالـیا پەیدابوو، لە دوای سێ ساڵ توانیی دەست بەسەر هەموو دامودەزگاکـانی دەوڵـەتدا بگرێـت. حـزبی فاشیسـتی ئەڵـەمان لـە ساڵی (١٩٢٠) دامەزرا، بۆ خەڵك هەڵفریواندنو خەڵك خەڵەتاندن ناوی حـزبی ناسـیۆناڵ سۆشیالیستیی لە خۆی نا، ئەم حزبە لە ساڵی (١٩٣٣) بە هۆی یارمەتیدانی دەزگا ئینحیسارییە گەورەکانی ئەڵەمانو دەرەوە حکومەتی گرتە ژێر دەستی خۆیو دیکتاتۆری خوێناوی هیتلەری سەقامگیر کرد.

تاقـیکردنەوەکانی ڕاپـەڕیـنی کرێکارانی ئەڵەمانیا لەو کاتەداو ڕەوشتی ئەپۆرتۆنیستانەی سۆشیاڵ دیموکراتە ڕاسترەوەکان بوون بە هـۆی تێکشـکاندنی هـێزی کـرێکارانی ئەڵـەمانو سـەرکەوتنی فاشیستەکان، لە ئەڵەمانیای هیتلەریدا حزبە شۆڕشگێڕەکانو نەقابەکانی کـرێکارانو هـەموو ڕێکخـراوە دیموکراتیـیەکانی تر یەك لە دوای یەك سەرکوتکران. ستەمێکی ڕەش دەسەڵاتی خۆی داسەپاند. چەندان ئەدیـبو ڕۆشـنبیری ئەڵەمانی لە ئەنجامی زەبرو زەنگی دیکتاتۆرییانەی هیتلەرییەکانو سیاسەتی فاشیستەکان ناچاربوون وڵات بەجێ بهێڵن.

فاشیسـتەکان سـوودیان لە تیۆری جیۆپلیتیکانەو هاندانی دەزگا ئینحیسارییە گەورەکان وەرئەگرتو ئەمەش بوو بە هۆی ئەوە کە جەنگێکی سـەرتاپاگیریی جیهانی لە پێناوی سەر لە نوێ دابەشکردنەوەی جیهان هەڵبگیرسێنن. ئەوە بوو دووەمین جەنگی جیهانییان هەڵگیرسـاند، کـە لـە ئـەنجامدا بـوو بـە هـۆی تێکشـکاندنو لەناوبـردنی توانـای سـەربازیو ئـابووریو سیاسـیی کۆنەپەرسـتانەی فاشیستەکانو سەرکەوتنی بەرەی گشتیی گەلان بەسەر فاشیزمدا.

لـە دوای ئـەم تێکشـکاندنەی بـەرەی فاشـیزم جـارێکی تـر عونسورە فاشیستەکان لە وڵاتە ئیمپریالیستییەکاندا کەوتنەوە چالاکیی فاشیسـتییانە نوانـدن. دەزگا ئیمپریالیسـتییەکانو کۆنەپەرستان یارمەتییان ئەدان ئەرکی پەروەردەکردنیان ئەکێشان. لە ئەڵەمانیای ڕۆژئـاوادا حزبێکی فاشیستیی تازە بە ناوی "ناسیۆناڵ دیموکرات" لەسەر ڕەوشتی فاشستەکان دامەزرا، لە بەریتانیاش دیسان چەندان دەسـتەو کۆمـەڵی فاشیسـتی چـالاکی خۆیـان ئـەنواند. لـە وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمـەریکاش چەندان دەستەو کۆمەڵی فاشیستییانە دامـەزراون. لـە فەرەنسـەش ڕێکخـراوێکی وەکـو لەشـکری نهێـنی هەیـە کـە پـیاوە کۆنەپەرسـتە سیاسییەکان ڕابەرایەتیی ئەکەن. یان ڕێکخـراوێك هەیـە کـە پێی ئەڵێن "ئۆکسیدان". لە ئیتالیا چەندان ڕێکخراوی فاشیستیی هەمە جۆر هەیە کە خۆیان ناو ناوە "ڕاپەڕینی سۆشیالیسـتییانەی ئیتالـیا". ڕژێمـی سـەرمایەداری یارمـەتی هـەموو ئـەم ڕێکخراوە فاشیستییانە ئەدات.. ئەمەش هەمووی لە پێناوی سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی کرێکارانو کۆمەڵانی خەڵکدا.

هـەروەکو باسمـان کـرد، فاشیزم بەرهەمی ئیمپریالیزمو دەزگا ئینحیسارییەکانە، هەروەها نازیزم هەمان ناوەڕۆکی فاشیزمی هەیەو ئـەم وشـەیە لـە پیـتە سـەرەتاییەکانی نـاوی حـزبی فاشیسـتی هیـتلەر وەرگـیراوە، کـە پـێی ئەوتـرا "حـزبی کـرێکارانی نەتـەوەیی سۆشیالیستی" بێگومان ئەو حزبە نە کرێکاری بووەو نە نەتەوەییو سۆشیالیستی.

### ★فالانخیزم، فالانژیزم - Falangisme

ڕاپەڕینی فاشیستەکانی ئەسپانیایە، واتە ئایدیۆلۆجیی تاکە حزبی یاسایی ئەسپانیا "فالانخە ئەسپانیۆلا ترادیسیۆنالیستا"یە[1].

فالانخیزم، یەکـەمجار (خـوزە ئانتۆنـیۆ پـریمودو ریـورا) کـوڕی دیکـتاتۆری پێشـوو پـریمودو ریـورا لـە مـانگی تشـرینی (١٩٣٣)دا دایمـەزراند. لـە مـانگی مارسـدا فالانخیستەکان لەگەڵ دەستەو کۆمەڵە فاشیستەکاندا بوون بە یەك، فالانخە ئەسپانیۆلای یەکگرتوویان بەڕابـەریی "خـوزە ریـورا" پێکهێنا. بـە پێی بەرنامەیەکی تاکڕەوی کە هەموو حزبە سیاسییەکان لەناو ببەتو سەرمایەی وڵات میللیی

١- Falange Spanola Tradicionlista

بکاتو چارەسەرکردنی زەویوزارو فراوانبوونی لەشکرو رەوشتی شۆڕشگێڕانەی گرتە خۆ بۆ ئەوەی بە ئامانجەکانی بگات. لە شەڕە ناوخۆییەکانی سالانی (١٩٣٦-١٩٣٩) ڕۆڵێکی گەورەی دیاری کرد. ئەم حزبە زۆر دژی چەپەکان بوو، لەگەڵ ئاراستە مامناوەندییەکانیشدا نە ئەگونجا، لەگەڵ "سۆشیالیستەکان، ..، ئانارشیستەکان" گەلێك گێرەو کێشەی نایەوە. ریورا لە مانگی شوباتی سالی (١٩٣٦)دا دەستگیرکراو لە مانگی تشرینی دووەمی هەمان سالدا کوژرا. لە مانگی نیسانی سالی (١٩٣٧)دا بە فەرمانی جەنەراڵ سیموفرانکۆ سەرکردەی لەشکر، فالانخە لەگەڵ ڕاپەڕینی سەلتەنەتخوازیی "کارلیست"دا یەکیان گرتو فرانکۆ ئایدیۆلۆجیی فالانخەی هەلبژاردو ئەم حزبە بوو بە حزبی سیاسەتی دەولەت، بەلام تا ئێستا نەیتوانیوە هیچ بەرنامەیەکی خۆی جێبەجێ بکات.

### ★فرماسیۆنی کۆمەلایەتیی ئابووری - Socio – Economic Farmasion

فرماسیۆن، یان سیستمی کۆمەلایەتی-ئابووری بریتییە لە ڕێڕەوی دیارو سەرخانێکی لەبار لەگەلیدا. لە مێژووی ئادەمیزاد دا پێنج سیستمی کۆمەلایەتی-ئابووری بەدی ئەکرێت.. کە بریتین لە: "کۆمەلگەی سۆشیالیستیی سەرەتایی، کۆیلەداری، فیودالیزم، سەرمایەداری، سۆشیالیزم".

هەر یەك لەم سیستمە کۆمەلایەتی-ئابوورییانە یاسایەکی تایبەتیی پەیدابوونو گەشەکردنی خۆی هەیە. لە هەمان کاتدا یاسایەکی گشتیشیان هەیە. گۆڕین لە ڕوخسارێکەوە بۆ ڕوخسارێکی تر شتێکی ڕێکەوت نییەو نەبووە، بەلکو بە پێی یاسایەکی تایبەتیی پێویست ئەنجام ئەگرێت.

بەو جۆرە کە لەناو دەروونی کۆمەلدا ناکۆکیی تایبەتیی ئەخولقێنێت کە ئەبنە هۆی لەناوبردنی سیستمی کۆمەلایەتیی کۆنو هاتنە کایەی سیستمێکی کۆمەلایەتیی تازەو پێشکەوتووانە تر. لە کۆمەلگەی چینایەتیدا لە ئەنجامی بەربەرەکانێی نێوان چینە ناکۆکەکان، سیستمی کۆمەلایەتی ئەگۆڕدرێتە بارودۆخێکی تر. لە ئەنجامی ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانە چینە پێشکەوتووەکان دەسەلاتی چینە دواکەوتووەکان لەناو ئەبەن.

### ★فارمر - Farmer

وشەیەکی ئینگلیزییە، بە مانا خاوەن زەوی یان خاوەن کێلگە ئەگرێتەوە.. فارمر بریتییە لە خاوەن زەوی یان ئەو کەسانەی کە پارچەیەك زەوی بەکرێ ئەگرن بۆ ئەوەی بەروبوومی کشتوکالی بەرهەم بهێنن. هەندێك کات فارمەرەکان خاوەن ئابوورییەکی کشتوکالیی شێوە سەرەتایین، ئەمجۆرەیان بە تایبەتی لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەریتانیا گەشەیان کردووە، لە ئەمریکا ژمارەیەکی زۆر لە فارمەرە بچووکەکان مالوێران کرانو لەسەر زەویوزاری خۆیان دەرکران، فارمەری گەورەو بە دەسەلات زەویوزارەکانیان گرتنە ژێر دەست خۆیانەوە. تەنانەت ئێستاش هەر لە ئەمریکادا خاوەن زەویوزارە بچووکەکان لەسەر زەوییەکانیان دەرئەکرێنو خاوەن زەویوزارە زۆرەکان کە سەرمایەی زۆریان بەدەستەوەیە چەندان ناوچەی کشتوکالیو کێلگەو زەویوزاری زۆر بەڕێوە ئەبەن. لە هەندێك ولاتانی تریشدا هەمان مەسەلە دووپات بووەتەوە. خاوەن زەویوزارە بچووکەکان لەسەر زەوییەکانیان دەرئەکرێنو خاوەن زەویوزارە بە دەسەلاتەکان دەست بەسەر زەوییەکانیانیاندائەگرنو داگیری ئەکەن.

### ★فیودالیزم - Feodalisme

فیودالیزم، ئەو سیستمە کۆمەلایەتی-ئابووری یەیە کە لە ئەنجامی لەناوچوونی کۆمەلگەی کۆیلەداری یان ڕاستەوخۆ لە ئەنجامی لەناوچوونی کۆمۆنی سەرەتایی بە پێی چەند خاسییەتێکی تایبەتیی خۆی لە هەر ولاتێکدا، یان لە زۆربەی کیشوەرەکانی جیهاندا هاتووەتە دی.

هۆیەکانی پەیدابوونی ئەم قۆناغە کۆمەلایەتییە لە منداڵدانی کۆمەلگەی کۆیلەداریدا بە شێوەی کۆلۆن خولقا. کۆلۆن بریتیبوون لەو کۆیلە ئازادکراوانە یان ئەو زەحمەتکێشە ئازادانە کە هەر یەکەیان بە پێی چەند مەرجێکی تایبەتی پارچەیەك زەوییان لە خاوەن زەویوزارەکان وەرئەگرت. هەر وەکو ئەرکێکی سەرشانیان ئەبوایە زەویی خاوەن زەوییەکان بکێلنو بەشێکی زۆرتر لە بەشی خۆیان بە خاوەن زەویوزارەکان بدەنو بە پێی ڕێکەوتنی نێوان خۆیان -واتە کۆلۆنو خاوەن زەوییەکان- بێگارو باجو خەراجی تریان بدابایە.

لە کۆتایی سەردەمی کۆیلەداری، ئەم شێوەی کارکردنە دەرامەتی بۆ خاوەن کۆیلەکان زۆرتربوو، کشتوکاڵ کارە تازەکان پابەستەی زەویوزار بوون، واتە لەگەڵ زەویوزارەکاندا ئەفرۆشرانو ئەکڕدران، بەلام ناوی کۆیلە یان کڕدراویان لەسەر نەبوو. ئەم جۆرە زەحمەتکێشە تازانە کە بە زمانی ڕۆمی پێیان ئەلێن "کۆلۆن" هەمان سرف یان ڕەعییەتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بوون.

بەرە بەرە جیاوازی لە نێوان کۆیلە ئازادکراوەکانو کۆلۆنەکانو جووتیارە ئازادەکاندا نەماو هەموویان بوون بە خەلکی زەحمەتکێش.. واتە "ڕەعیەت" کە لە ڕۆژئاوا "سرف"ی پێ ئەوترا. بەو جۆرە سەردەمی فیودالیزم دیسان بە سەردەمی "سرواژ"یش ناو ئەبرێت.

لە سیستمی کۆمەلایەتی-ئابووریی فیودالیزمدا چینە بنچینەییەکانی کۆمەڵ بریتین لە جووتیاران "ڕەنجدەران"و خاوەن مولکەکان، واتە فیودالەکان "بەرهەم خۆرەکان". لەم قۆناغەدا جووتیارانو پیشەکارەکان گەورەترین هۆی شۆڕشگێڕانەن.

لە کۆمەلگەی ڕۆژهەلاتیی کۆندا، بە پێی ئەو پشکنینو لێکۆلینەوانەی کە تا ئێستا بە دەست گەیشتووە دەر ئەکەوێت کە دابەشکردنی کۆمەڵ لە سەرەتاوە بە ئازادو کۆیلەداری نەکراوە، بەلکو کراوە بە دوو کۆمەڵ: دەولەمەندو هەژار.. سەرەك هۆزەکان،

سەرکردەکانی لەشکر، پیاوە ئاینییەکان، هەر یەکە بە پێی ئەرکی تایبەتیی خۆیان‌و خاوەنداریێتیی زەوییزار، ئاودێری، ئاژەڵداری، و.. ئەمجۆرە کارانە دەسەڵاتدارو دەوڵەمەند بوون، توێژەکانی تری کۆمەڵیش هەژارو دەستکورت بوون.

یەکگرتنی هۆزەکان‌و دامەزراندنی شانشینی بچووک‌و هاتنە سەرکاری دەسەڵاتی دەوڵەتی ڕێگەی گەشەکردنی ئەم کۆمەڵگەیە بوون، کە ڕژێمی کۆیلەداری دەسەڵاتی بەهێزی تیایانا نەبوو. هەرچەند خاوەن کۆیلەکان لە ئارادا هەبوون، بەڵام هەرگیز وەکو چینێکی فراوان‌و هێزی بنچینەیی کۆمەڵ دەر نەئەکەوتن.

سەردەمی فیوداڵیزم، قۆناغێکی پێویستی پێگەیشتنی کۆمەڵگەی ئادەمیزاد بوو، وە لە کاتی خۆیدا گەلێك یارمەتیی گەشەکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکانی داوە. شێرازەی بنچینەیی بەرهەمهێنانی ئەو سەردەمی کشتوکاڵی بوو. هۆیە بەرهەمهێنەرەکانی سەردەمی فیوداڵی لەسەر خاوەنداریێتیی زەوییزار، تاڕادەیەك خاوەن ڕەعیەتی بوو.

ڕەعیەت، کۆیلە نەبوو، چارەنووسی ژیانی بە دەست خاوەن موڵکەوە نەبوو، ڕاستەوخۆ نە ئەفرۆشرا. ئەگەرچی لەگەڵ پارچە زەوییەکدا کە ئەفرۆشرا ڕەعیەتەکەشی پێوە ئەڕۆیشت.. لەو سەردەمەدا خاوەنداریێتیی فیوداڵی‌و خاوەنداریێتیی تاکە کەسی وەکو جوتیارو پیشەکارە خاوەن هۆیەکانی بەرهەمهێنان هەبوون. بەرهەمی زیادەی ڕەعییەتەکان ئەدرا بە خاوەن موڵکەکان بە شێوەی کرێی ئەو زەوییزارانەی کە ئەیان کێڵان.

**★فیدراسیۆن - Fedration**

لە وشەی **Foederatus** ی لاتینییەوە وەرگیراوە کە بە مانا "کۆکردنەوە" ئەگرێتەوە. یەکێتیی نێوان چەند ڕێکخراوێك یان وڵاتێك، دامەزراندنی دەوڵەتێك لە فیدراسیۆندا چەندان دەستەو کۆمەڵ‌و ڕێکخراوی بچووك بە زۆری کاروباری دەرەوەی خۆیان ئەدەنە دەست فیدراسیۆنەکەیان. یاسای بنچینەیی فیدراسیۆن سنوری ناوخۆی ئەندامانی فیدراسیۆنەکە دیاری ئەکات.

لە سیستەمی ئەو دەوڵەتانەدا کە فیدراڵن دادگایەکی باڵا هەیە، کە یاسای وڵات دائەنێت‌و ناکۆکیی نێوان دەوڵەتەکانی ئەندامی فیدراسیۆنەکە چارەسەر ئەکات.. لەو جۆرە دەوڵەتانەدا یاسای بنچینەیی بە پێی ڕاوێژی دەوڵەتانی ئەندامی فیدراسیۆنەکە دائەنرێت.

**★فابیانیزم - Fabianisme**

ڕێبازی سیاسیی ڕێکخراوێکی سۆشیالیستییانەیە لە بەریتانیا، کە لە لایەن ڕۆشنبیرە سۆشیالیستییەکانی ئەو وڵاتەوە لە ساڵی (١٨٨٤)دا دامەزراوە. ئەمانە زۆر هەوڵیان داوە کە سۆشیالیزم لە چینی ناوەڕاست پێکبهێنن‌و لە هەمان کاتدا لایەنگری پێکهێنانی سۆشیالیستی لەسەر خۆ بوون. ئەمانە لە دوایدا بوونە پایەی دامەزراندنی ڕێکخراوی کرێکارانی بەریتانیا، دوای دامەزراندنی ڕێکخراوەکەش لەو باوەڕەدا بوون کە:

**یەکەم:**

چارەسەرکردنی کۆمەڵایەتیانە باری ژیان‌و گوزەرانی کرێکار باش ئەکات‌و ئیتر هیچ پێویستی بە شۆڕش‌و ڕاپەڕین‌و توندوتیژیی ناکات.

**دووەم:**

هیچ جۆرە پێکدا هەڵچوونێکی چینایەتی بۆ بەرزبوونەوەی ئاستی کۆمەڵایەتیی پێویست نییە.

**★ڤیتۆ - Veto**

ڤیتۆ بەرگرتنە لە کارێك‌و "مافی ڤیتۆ" ماف یا توانای بەرگرتنە.. بەم پێیە "ڤیتۆ" یان "مافی ڤیتۆ" دەسەڵاتی یاسایی دەزگایەکی دەوڵەتی یان ئەندامانی ئەو جۆرە دەزگایانەیە بۆ بەرگرتن لە کاری ئەو دەزگایە یان هەر دەزگایەکی تر، یان ئەندامەکانی بێت.

ئەم زاراوەیە لە بواری یاسایی چالاکییەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا مانایەکی تایبەتیی هەیە، لەم بارەیەوە مافی ڤیتۆ بە مانای مافی ئەندامێکی هەمیشەیی ئەنجومەنەکەیە بۆ بەرگرتن لە کارێك کە دەنگی لەسەر درابێت لە لایەن ئەندامانی تری ئەنجومەنەکەوە.

لە یاسای گشتیی نیشتمانیدا ڤیتۆ بە مافی سەرچاوەیەکی خاوەن لێپرسینەوە بۆ بەرگرتنی یان دواخستنی کارێکی یاسایی ئەوترێت.. لە ڕۆمی کۆندا "تریبونەکانی خەڵك" بۆ ڕەتکردنەوەی یاساو دەستووری فەرمانبەرانی تر سوودیان لە بەکارهێنانی مافی ڤیتۆ وەر ئەگرت.

ڤیتۆ لە رووی مێژووییەوە تا ڕادەیەك بە کارێکی یاسایی بەرپەرچدانەوە واتە (ڕەتکردنەوەی یاسا) لە لایەن ئۆرگانێکی دەسەڵاتداری نیشتمانییەوە دائەنرێت. لە کاتی ئائاسایشدا هەندێك لە دەزگا یاساییەکانی وەکو ئەنجومەنی لۆردەکانی بەریتانیا، دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە کە هەر کارێك بیانەوێت بە هۆی بەکارهێنانی مافی ڤیتۆوە دوای بخەن. پادشای بەریتانیا مافی ڤیتۆی هەیە، بەڵام هەرگیز سوودی لێ وەر نەگرتووە، چونکە لە کاتێکدا لێپرسینەوە لە ئەستۆی ئەنجومەنی وەزیراندا بێت ئیتر ئەو مافە پووچ بووەتەوە.. بەڵام سەرکۆماری ئەمریکا ئەتوانێت یاسایەك ڕەت بکاتەوە کە کۆنگرە بڕیاری لەسەر دابێت، مەگەر لە کاتێکدا نەبێت کە دیسانەوە دوو سێیەکی کۆنگرە دەنگی لەسەر بداتەوە.

هەر یەك لە ئەندامانی ئەنجومەنی "پۆڵەندە-لهستان" لە سەدەکانی حەڤدەیەم و هەژدەیەمدا تاکو هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنەکە واتە ساڵی (۱۷۹۱) هەموویان مافی بەکارهێنانی ڤیتۆیان هەبووە، وە هەر یەك لەو ئەندامانە توانای ئەوەیان هەبووە هەر کارێکی دەنگ لەسەردراو هەڵ بوەشێننەوە.

بەڵام ئەم زاراوەیە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا مانایەکی -تاڕادەیەك- جیاوازی هەیە. بەندی (۲۷) بیستو حەوتەمی بڵاوکراوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەڵێت:

*"تەنیا لە بارەی کاری یاساییو چارەسەرکردنی ئاشتیانەوە لایەنی سەرپێچی کار ناتوانێت رای خۆی دەر ببڕێت، ئەبێت لەگەڵ رای هەر حەوت دەوڵەتە ئەندامەکەی ئەنجومەندا بێت".*

لەبەر ئەمە بەکارهێنانی مافی ڤیتۆ لە ئەنجومەنەکەدا بە دەست ئەندامێك یان چەند ئەندامێکی هەمیشەییەوەیە بۆ بەرگرتن لە هەر کارێکی یاساییو سیاسی کە بیانەوێت نەکرێت.

### ★کۆیلەیەتی - Escalavagisme

کۆیلەیەتی یەکەمین شێوەی بەندکردنی کۆمەڵایەتی-ئابوورییە لەسەر بنچینەی سوود وەرگرتنی کەسێك لە کەسێکی تر دامەزراوە، کۆیلەیەتی لە قۆناغی لەناوچوونی کۆمۆنەی سەرەتاییدا لەسەر پایەی یەکسانی نەبوونیباری ئابووریی تاکەکەس، لە ئەنجامی پەیدابوونی موڵکدارێتیی تاکەکەس هاتە کایەوە.

ئەم کۆیلەیەتییە یەکەمجار لە میسری کۆن، بابل، ئاشور، چین، هیندستانو.. پەیدا بوو، بەڵام یۆنانو ڕۆمی کۆن بە شێوەی کلاسیکی خۆی پێگەیشت.. لە ڕۆژهەڵاتدا بە زۆری کۆیلەیەتی خاسییەتی سەردەمی "باوك سالاری" بوو[1].

دوو چینی کۆمەڵ -کۆیلەو خاوەن کۆیلە- ڕواڵەتی ئەم سیستەمە کۆمەڵایەتیو ئابوورییەیان نیشان ئەدا. چینە ناوەندییەکان وەکو خاوەن موڵکە بچووکەکانو پیشە کارانو عونسورە بێ چینەکان کە لە خاوەن موڵکە بچووکەکان دواکەوتووتر بوونو کۆیلەیان نەبوو، هەموویان لە ئارادا بوونو هەبوون.

پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لەو سەردەمەدا بریتی بوون لە خاوەن کۆیلەکانو خاوەن هۆیەکانی بەرهەمهێنان.. کۆیلە وەکو کەرەسەیەکی بازرگانی، کڕینو فرۆشتنی پێوە ئەکرا. خاوەن کۆیلەکان خاوەنی گیانی کۆیلەکان بوون. خاوەن کۆیلەکان چەند توێژێکی جۆر بە جۆر بوون، وەکو موڵکە گەورەکان، خاوەن کارگەکانو مامەڵە چییەکان.

ناکۆکیی چینایەتی کە ڕاپەڕینی کۆیلەکانیشی ئەگرتەوە سیستەمی کۆمەڵایەتیی کۆیلەداریی گۆڕی، جۆرە چەوساندنەوەیەکی تری کۆمەڵایەتی جێگەی گرتەوە، ئەویش سیستەمی فیوداڵی بوو. ئەم سیستەمە لەچاو رابوردووی پێشکەوتووانە تر بوو، ماوەی فراوانتری لە بەردەم گەشەکردنی هێزەکانی بەرهەمهێناندا ڕەخساند. ئەگەر چی ڕوخساری کۆمەڵایەتی-ئابووریی کۆیلەیەتی وەکو قۆناغێکی مێژوویی گەشەکردووی کۆمەڵایەتی لەناو چوو، بەڵام مەسەلەی کۆیلەیەتی بە چەندان شێوەی جۆر بە جۆر لە ڕۆژگاری فیوداڵیزمدا - تەنانەت تا گەلێك دواتریش- هەر مایەوە، بۆ نموونە، تا ماوەی زیاتر لە سەد ساڵ لەمەوبەر[2] لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، یان لە بەشێکی زۆری وڵاتە ژێردەستەو شێوە ژێردەستەکاندا، تەنانەت تا ئێستاش هەر ماوەتەوە.

### ★کۆماری - Republic

جۆرە حکومەتێکە، کە جێگەداری سەرۆکی دەوڵەت کارێکی میراتگرانە نییە، زۆربەی جار ماوەی حوکمی سەرۆکی دەوڵەت دیاری ئەکرێت، دیاریکردنی سەرکۆمار بە هەڵبژاردنی خەڵك ئەبێت. مەفهوومی کۆماری بە زۆری ڕوخساری دیموکراتیانە ئەبەخشێ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە زۆر دیکتاتۆری ناسەڵتەنەتی ئەوترێت، بەڵام ئەو کۆمارە دیکتاتۆرییانە مەفهوومی سروشتی یان "نا سەڵتەنەتی" یە.

لە ڕێبازی سیاسییانەی ڕۆژئاوادا، بەر لە شۆڕشی ئەمریکاو فەرەنسە، بە هەموو دەوڵەتێکیان ئەوت کۆماری، تەنانەت بە دەوڵەتە سەڵتەنەتیو ئاریستۆکراسیەکانیشیان ئەوت. ئەو دەوڵەتانەش کە ئازادیی سیاسییان تێدا کەم بوو، بەڵام قازانجی خەڵکیان ئەپاراست پێیان ئەوتن "کۆماری".

ژان بودن[1] سیاسەتمەداری ناسراوی سەدەی شازدەیەم لە کتێبی "کۆماری"دا باسی سەڵتەنەت، ئاریستۆکراسی، دەوڵەتی خەڵکی ئەکات.

لە سەردەمی شۆڕشی ئەمریکاو فەرەنسەدا بەو دەوڵەتانەیان ئەوت کۆماری کە یاسایەکی ئازادی هەبایەو مافی شارستانێتیی هاونیشتمانیو ئازادیی تاکە کەسی تێدا بپارێزرابایە. ئەو کەسانەی کە دژی سیستەمی سەڵتەنەتیش بوون پێیان ئەوتن "کۆماریخوازەکان".

بەڵام دوای سەقامگیربوونی دیموکراسی لە زۆربەی دەوڵەتە سەڵتەنەتییەکاندا کۆماری خوازی ئەو ناوەی خۆی لە دەست دا، چونکە دەوڵەتە سەڵتەنەتییەکان وایان لێهات خەڵکیان بە سەرچاوەی دەسەڵاتی خۆیان ئەزانی، نەك ئیرادەی خواوەندی. هەندێك لە کۆنە پارێزە ئەمریکاییەکان مانای کۆمارییان بە حکومەتی مەشروطە، حکومەتی یاساو یاسایی بوونی حکومەتیان لێك ئەدایەوە.

**کۆمارییە تازەکان ئەکرێن بە سا بەشەوە:**

---

۱-ئەو سەردەمە کۆمەڵایەتییە کە ئەرکی گەورەی ماڵ بەسەر پیاوانەوە بووەو لە ئێراندا پێی ئەڵێن "پدر شاهی" یان "پدر سالاری"-وەرگێڕ.

۲-لە سەردەمی نووسینی کتێبەکە ئەگرێتەوە.

۱- J – B0din

**یەکەم:**

کۆمارییە دیموکراتییەکانی ڕۆژئاوا کە ڕیشەیان ئەگاتەوە سەر شۆڕشەکانی سەدەی هەژدەیەمو نۆزدەیەم، وەکو "فەرەنسەو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا" .. یان ئەو وڵاتانەی کە لە دواییدا ئەم ڕێبازەیان گرتەبەر، وەکو (ئیتالیا، ئەڵەمانی ڕۆژئاوا).. لەم وڵاتانەدا کۆماری شان بە شانی دیموکراسی ئەڕوات، پلەی دیموکراسی لەو وڵاتانەدا لەگەڵ وڵاتە سەڵتەنەتییە مەشروطەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوادا وەکو وڵاتەکانی ئەسکەندەناڤیا، بەریتانیا، هۆڵەندە، هیچ جیاوازییەکیان نییە.

**دووەم:**

ئەو وڵاتانەی کە بە ڕەسمی کۆمارینو کەچی لە هەمان کاتدا ڕژێمی سەربازیو پۆلیسی تیایاندا حوکمڕەوایە، وەکو زۆربەی وڵاتەکانی ئەمەریکای ناوەندو خوارووو پورتوگالو ئەسپانیا.

**سێیەم:**

کۆمارە دیموکراتییە گەلییەکان کە لە ئەورووپاو ئاسیای ڕۆژهەڵاتدا دامەزراوون. لەو وڵاتانەدا ناونیشانی ڕەسمیی دەوڵەت "دیکتاتۆری پرۆلیتارییایە".

### ★کۆسمۆپۆلیتیزم - Cosmopolitisme

بەرامبەر بە "شۆڤینیزم" تیۆریو سیاسەتی "کۆسمۆپۆلیتیزم"[٢] هەیە، کە بە "جیهان نیشتمان"ی ناو ئەبرێت. ئەم تیۆرییە هیچ بایەخێك بە قازانجی نیشتمانو خەڵکی نەتەوەو فەرهەنگی نەتەوایەتیانەو مێژووی نەتەوەی خۆی نادات، ئەمەش دیسان تیۆرییەکی بۆرجوازییانەی کۆنەپەرستانەیە. لەو زەمینەدا کەسایەتیی نەتەوەو دەسەڵاتی نەتەوەو پێویستیی ڕاپەڕین لە پێناوی سەربەخۆییو سەربەرزیی نەتەوەدا بایەخی نییە. ئەوانەی بەمجۆرە بیر ئەکەنەوە داوای دەوڵەتێکی سەرتاسەریی جیهان ئەکەن، کە ئەوەش سەپاندنی ئیمپریالیزم بەسەر هەموو گەلانی جیهاندا ئەگرێتەوە.

لە وڵاتەکانی جیهانی سێیەمو ئەو وڵاتانەی تردا کە لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزمدان، داخوازیی سەربەخۆیی نەتەوەیی ئەوەندە بەهێزە کە کۆسمۆپۆلیتیزمەکان ناتوانن ناوێرن داکۆکی لەسەر ئەو تیۆرییەی خۆیان بکەن. شۆڤینیزمو کۆسمۆپۆلیتیزم هەردووکیان ڕاپەڕینی دژی ئیمپریالیزم بە هەڵە ئەزانن، مەترسیی ئەخەنە بەر ڕاپەڕینی نەتەوایەتییانەو ئازادیخوازانەوە.

### ★کولتوور - Colture

بریتییە لە کۆمەڵە بەهایەکی مادیو مەعنەویی کۆمەڵگەی ئادەمیزاد، کە لە ئەنجامی گۆڕینی کۆمەڵایەتی-مێژوویی پەیدا ئەبێت. کولتوور، هەموو چالاکییە بونیات نەرەکانی ئادەمیزاد ئەگرێتەوە، وە هەمیشە دوو لایەنی بە یەکەوە پەیوەندیداری هەمیشەیی هەیە، وەکو:

١-*کولتووری مادی.*

٢-*کولتووری مەعنەوی.*

**کولتووری مادی:**

بریتییە لە کۆمەڵە هۆیەکی بەرهەمهێنان، تەکنیك، تاقیکردنەوەی بەرهەمهێنان، هەموو بەها مادییەکانی تری کۆمەڵ لە هەر قۆناغێکی پێگەیشتنی مێژوویی خۆیدا بە خۆیەوە ئەگرێت.

**کولتووری مەعنەوی:**

کۆمەڵە دەستکەوتێکی زانستیو هونەریو ڕەوشتیو فەلسەفەیی کۆمەڵ.

کولتوور، دیاردەیەکی مێژووییە کە پەیوەندیی بە قۆناغەکانی فرماسیۆنی کۆمەڵایەتی-ئابووریی کۆمەڵگەوە هەیە. بە پێچەوانەی تیۆریی ئایدیالیستەکان کە کولتووری مەعنەوی لە بناغەی مادی جیا ئەکەنەوەو بە بەرهەمێکی دەروونیی دائەنێن.

تیۆریی شۆڕشگێڕانە ڕێبازی بەرهەمهێنانی نیعمەتی ماددی بە پایەو سەرچاوەی گەشەکردنی کولتووری مەعنەویی دائەنێو بە بەرهەمی کارو چالاکیو کرداری کۆمەڵانی زەحمەتکێش ئەزانێت. بە بێ پەیوەندیی نێوان کولتووری ماددیو کولتووری مەعنەوی، کولتووری مەعنەوی خۆی لە خۆیدا توانای هیچ جۆرە گۆڕانێکی نییە، چونکە سەربەخۆییەکی نیسبیو یاسای تایبەتیی خۆی هەیە.

لە کۆمەڵگەی چینایەتیدا کولتوور بریتییە لە چەند خاسییەتێکی چینایەتییانە، هەر چینێکی پێشکەوتوو خاوەنی کولتوورێکی پێشکەوتووانەیە، لەگەڵ پەیدابوونو شان بە شانی گەشەکردنی هەر نەتەوەیەك کولتووری نەتەوایەتییانەش گەشە ئەکات.. لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا لەناو کولتووری نەتەوایەتییانەدا دوو جۆر کولتووری مەعنەوی هەیە:

**یەکەم:**

کولتووری بۆرجوازی: تیشکدانەوەی قازانجی چینە چەوسێنەرەکانەو بایەخ بە هەمیشەیی مانەوەی ڕژێمی سەرمایەداری ئەدات.. لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا چەندان عونسوری سەر بە کولتووری سۆشیالیستیو دیموکراتی هەیەو پەیدا ئەبێت کە داکۆکی لەسەر قازانجی زەحمەتکێشان ئەکات، پرۆلیتاریا خاوەنی پێشکەوتووانەترین کولتووری مەعنەوییەو ئەرکی داهێنانی کولتوورێکی تازەی سۆشیالیستیانەیان لە ئەستۆدایە. لەبەر ئەوە نابێت کولتووری کۆمەڵگەی سەرمایەداری بە کولتووری بۆرجوازی بزانین.

**دووەم:**

---

٢-Cosmopolitisme

کولـتووری نوێـی سۆشیالیسـتییانە: لەسەر تیۆری شۆڕشگێڕانە پێکهاتووەو هۆیەکی کاریگەرانەی پەروەردە کردنی شۆڕشگێڕانەی زەحمەتکێشانە.

لە هەندێك نووسیندا وشەی "کولتوور"[1] سێ مانای لە یەکتر جیا جیایان هەیە:

**یەکەم:**

بـە مانـای شارسـتانێتی، هەڵسوکـەوتی کۆمەڵگـە، بـەهای پـەیوەندیی کۆمـەڵ لەگـەڵ شارستانێتیدا. شۆڕشی فەرهەنگی[2] کە لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا لە دوای شۆڕشی سیاسیو کۆمەڵایەتییەوە ڕوو ئەدات ئەم مەفهوومە ئەگرێتەوە.

**دووەم:**

بە مانا ئایدیۆلۆجی، دەرخستنی پەیوەندیی نێوان هەر مرۆڤێكو جیهان، دابەشکردنی هەر فەرهەنگێك بە دوو بەش:

*١- فەرهەنگی بۆرجوازیی فەرمانڕەواو کۆنەپەرست.*

*٢- فەرهـەنگی دیموکراتیو سۆشیالیستی.. کە پەیوەندە بە کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێشەوە. شۆڕشی فەرهەنگی لەم کاتەدا بەو مانایەیە کە پێویستە فەرهەنگی ئایدیۆلۆجیی بۆرجوازی جێگەی خۆی بۆ فەرهەنگی سۆشیالیستی چۆڵ ئەکات.*

**سێیەم:**

بـە مانـای ئامۆژگـاریی یان زانست، زانستە هونەرییەکان، زانیاریی گشتی، لەو بوارەدا مەفهوومی "نەبوونی فەرهەنگ، یان نەبوونی کولتوور" وە یان بڵێین "بێ فەرهەنگی" بە مانای نەبوونی زانیاری، نەخوێندەواری، نەزانینو شتی پڕوپووچ ئەگرێتەوە.

### ★کاپیتۆلاسیۆن - Capitulation

لـە ڕووی مێژوویـیەوە ئـەم زاراوەیـە لـە سـەدەکانی دەیەم تا دوازدەیەمی زایینی پەیدا بووە، بریتی بووە لە مافێکی تایبەتی کە لە "بـیزانس" بـەو شـارە بازرگانییە گەشـە کـردووانە ئەدرا لە ئیتالیا کە لە بواری بازرگانیدا پێشکەوتوو بوون، لەو سەدەیانەدا دەوڵەتی ناوچەیی ئەیتوانی بە پێی قازانجی خۆی ئەم مافە زیادو کەم پێ بکات، وە یان قەدەغەی بکات.

لـە دوای دامـەزراندنی ئیمپراتۆریـیەتی عوسمانییەکان ئەم مافە بەو شارانە ئەدرا کە سەر بە ئیمپراتۆرییەتەکە بوون، لە ناوەڕاستی سـەدەی شـازدەیەمدا ئـەم مافـە لـە لایـەن عوسمانییەکانەوە درا بـە بازرگانـە فەرەنسییەکان. زانایان ئەمەیان بە ئیجازەی تایبەتیی ئیمپراتۆرییەتەکان لێکداوەتەوە، کـە لـە لایـەن بـابی عـالی "دەربـارەی عوسمانییەکان" هوە ئەدرا بە وڵاتە ئەوروپاییەکان، تاکو هیچ کـەس ڕێگـەی مامەڵەو مامەڵە کارییان لێ نەگیرێت. خاسییەتێکی تایبەتیی ئەم بڕیار نامەیە ئەوە بوو کە هەمیشە یەك لایەنە بوو. واتە تەنیا لەلایەن دەوڵەتێکەوە ئەدرا.

لـە ناوەڕاسـتی سـەدەی هەژدەیـەمدا "کاپیتولاسیۆن" خاسیەتێکی تایبەتییانەی بە خۆوە گرت.. بەو مانایە کە لە لایەن دەوڵەتە گەورە ئەوروپاییەکانەوە ئەدرا بە کیشوەرەکانی ڕۆژهەڵاتو ئیتر بە شێوەی یەك لایەنیانە ڕەت نەئەکرایەوە.

کاپیتولاسیۆن، لـە کۆتـایی سـەدەی هـەژدەو سـەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا لە ئێرانو چینو ژاپۆنو هەندێك وڵاتانی تری ئاسیاو ئەفـەریقادا کـاری پـێ ئەکـرا.. ڕژێمـی "کاپیتولاسـیۆن" گەلـێك یارمەتـیی بـە دەسـەڵاتدارانی سـەرمایەو بـازاڕی ئـەوروپاو وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمـریکاو بـە دواکـەوتوویی مانـەوەی ئـەم وڵاتانـە دا. قونصـوڵگەریی وڵاتـە سـەرمایەدارییەکان دەسـەڵاتی ئـیداریو پۆلیسیو یاسایی تایبەتییان پێ درابوو.

کاپیتۆلاسیۆن، لەگـەڵ مـافی دەسـەڵاتداریتیو سـەربەخۆیی خـەڵکدا جیاوازیـیەکی ئاشـکرای دیـاری هەیـە، کـە شۆڕشی گەورەی سۆشیالیسـتی سـەرکەوت -لـەزۆر شـوێندا- دەمودەسـت ڕژێمـی کاپیتۆلاسـیۆنی بـە شـێوەیەك لـە شێوەکانی ئیستیعمارگەری دانراو قەدەغە کرا.

### ★کرێکاری کشتوکاڵی - Peasants Farmers

یـان پرۆلیـتاریای کشـتوکاڵی، بریتییە لە کرێکاری ڕۆژانە، کە لە کێڵگە کشتوکاڵییەکانی سەرمایەدارەکاندا کار ئەکەن، زۆربەی ئەم کرێکارانە ئـەو جووتـیارە سیاسـیانەن[1] کـە زەویوزاریـان نیـیە، وەیـان ئـەوەندەیان نیـیە بەشـی گوزەرانـی خۆیان بکات.. بۆ خۆ بە خێوکردن لە کێڵگە کشتوکاڵییە سەرمایەدارییەکاندا بە ڕۆژانە کار ئەکەن.

لـە ڕژێمـی سـەرمایەداریدا کشـتوکاڵ کارەکان، یان بڵێین جووتیارەکان بە زۆری هەژارو دەستکورتن.. بەشێکی زۆریان ناچار ئەبنە کرێکاری کشتوکاڵ.

کـرێکارە کشـتوکاڵییەکان لـە ڕووی پەیوەندییـانەوە لەگـەڵ هۆیـەکانی بەرهەمهێناندا هیچ خاوەندارێتیی یان خاوەن ماڵێتییەکیان نیـیە، بـەڵام لـە ڕووی هـەندێك مـەرجی تایبەتیـیەوە کـە سـتەمو زۆریـان لـێ ئەکرێ چەوساوەترین توێژی چینی کرێکارن. ئەو خاوەن سـەرمایەی حوکمیـان بەسـەردا ئـەکاتو ئـەیان چەوسـێنێتەوە، خـاوەن زەویوزارەکـانن، کـە زۆربەیان سەرمایەداری خاوەن زەویوزارو مەکانیزەو بـانقو دەزگـاو دامـەزراوە ئابوورییـە هەمـە جۆرەکانو خاوەن کۆمپانیاو کۆلاكو خاوەن پارەو سەرمایەداری لادێو خاوەن ڕەعیەتەکانن.

---

١- Culture

٢- لێرەدا فەرهەنگ مەبەست هەمان کولتووری سەرەوەیە- وەرگێڕ.

١- ئەو جووتیارانەن کە زەویوزاریان نییە- وەرگێڕ.

لـە کۆمەڵگـەی سۆشیالیسـتیدا کـە چەوساندنەوە نامێنێتو زەویـوزار ئەدرێت بـە جووتـیارەکانو کشـتوکاڵ ئەبێـتە دەزگایـەکی هـەرەوەز کارانـەو توێـژە جـۆر بـە جۆرەکانی چینی سەرمایەدارو چەوسێنەرەوەکان لەناو ئەچن، لەو کاتەدا کرێکاری کشتوکاڵیش بەو جۆرەی کە لە ڕابردوودا بووە نامێنێتەوە.

### ⋆کۆمۆنی سەرەتایی - komom

کۆمۆنـی سـەرەتایی، یـان کۆمەڵگـەی هاوبەشـی سـەرەتایی، یەکـەمین شـێوەی بەرهەمهێـنانە لـە مـێژوودا، لـەو کۆمەڵگەیـەدا موڵکدارێتـیی دەسـتە کۆمـەڵی هـەبوو، لـە سـەرەتای پـەیدابوونی کۆمەڵگـەی ئادەمـیزاددا، هۆیـەکانی بەرهەمهێـنانو کارکـردن زۆر سەرەتاییو دەستە کۆمەڵی بوون.

زەوی، هۆیـەکانی کارکـردن، شـوێنی نیشـتەجێو.. ئەمانەو هەموو شتێکی تری پێویستی ئەو سەردەمە بە هاوبەشی هینی هەموو خـەڵك بـوون. بەرهەمهێـنان بـە شـێوەی دەسـتە کۆمـەڵیو بە هۆیە سەرەتاییەکانی کارکردن ساز ئەبوو، وەکو ڕاوکردنو کۆکردنەوەی میوەو بـەروبوومی درەخـتو ئـەمجۆرە شـتانە. هـەموو بەروبوومـێکی کارکـردن بـە دەسـتە کۆمـەڵی کۆ ئەکرایەوەو پێکەوە ئەخورا.. موڵکدارێتـیی هاوبەشی ئەو کاتە بریتی بوو لە موڵکدارێتیی دەستە کۆمەڵی بچووكو جیا جیا لە یەکتر. شان بە شانی ئەم موڵکدارێتییە هاوبەشییە موڵکدارێتیی تاکە کەسیش هەبوو.

ئـەم هۆیانـەی بەرهەمهێـنان بـە هاوبەشـیی لـە سـەردەمی کۆمۆنـی سـەرەتاییدا لـە ئـەنجامی هۆشـیاریی خـەڵکەوە نەبووە، بەڵکو پێویسـتییەکی بوونـی کـاری دەسـتە کۆمەڵی بووە لە شێوەیەکی زۆر سەرەتاییدا، چونکە لەو سەردەمەدا زۆر ستەم بووە تاکە کەسێك بـە بـێ هاریکـاریی دەسـتە کۆمەڵی بتوانێت کارێك بە ئەنجام بگەیەنێت یان ببێتە خاوەنی خۆراکێکی ڕۆژانە.. یان بتوانێت بەر پەرچی هـێزە سروشـتییەکان بداتـەوە. لـەو کاتـەدا ژیـانو کـاری دەسـتە کۆمـەڵیو بەرگریکـردن لـە ڕووی سروشتدا بە دەستە کۆمەڵی نەبایە ئـەنجام نـە ئـەدرا.. لـەو کاتـەدا مـرۆڤ هەرچـەند هەوڵـیدابایەو خـۆی مـاندوو کـردبایە لـە خۆراکـی ڕۆژانـەی خـۆی زیاتـر توانـای هـیچ پاشەکەوتێکی تری نە ئەبوو.

لـەو سـەردەمەدا، ئـەو سیسـتمە کۆمەڵایەتـییەی کـە چـەندان ملـیۆن ساڵ درێژەی کێشا، بە هیچ جۆر چەوساندنەوەو زۆرکردن لە ئـارادا نـەبوو. لەبـەر ئـەوەی ڕادەی بەرهەمهێـنان زۆر لاواز بوو یەکسانیی بۆ هەموو وەکو یەك بوو.. چەوساندنەوەو دەست بە سەردا گرتن لە ئارادا نەبوو.

بـەرە بـەرە هۆیـەکانی بەرهەمهێنانو دابەشـکردنی سروشتییانەی کار هاتنە کایەوە، واتە ئیشو کار بە پێی ڕەگەزەکانی نێرو مێ دیاریکـران.. یـان بـە پـێی توانـای گـەنجیو پیری دابەشکران.. لە ئەنجامی گەشەکردنی ئابووری –بەو شێوە سەرەتاییەو– زۆر بوونی ژمارەی خەڵك، تیرەو خێڵ پەیدا بوون.

لـە سـەرەتاوە ئـەرکی بەڕێوەبـردنی کـارو ژیـان لـە ئەستۆی ژناندا بوو، کە پێیان ئەوت "ماتریار کال" واتە "مێ وەجاخی"[1] یان دایك سـالاری. دوای ڕۆژگـارێك پیاوان توانییان ببنە خاوەنی ئەرکی بەڕێوەبردنی کاروبار کە ئەو قۆناغە بە قۆناغی "پاتریار کال" واتە "نێر وەجاخی" یان باوك سالاری[2] ناو نراوە.

لـە دوا قۆنـاغی فرماسـیۆنی کۆمەڵایـەتی–ئـابووریی کۆمۆنـی سـەرەتاییدا شـان بـە شـانی گەشـەکردنی ئاژەڵداریو کشتوکاڵکاری دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتییانە هاتە کایەوە. ئاڵوگۆڕ لە نێوان ئەندامانی خێڵو تیرەکاندا داهات.

یەکـەمین دابەشـکردنی گـەورەی کۆمەڵایـەتی جیابوونەوەی هـۆزو ئاژەڵدارەکان بوو. دوای ئەوە هەرچەند هۆیەکانی بەرهەمهێنان پێشـتر کەوتـبایە ئـەوەندە بەروبوومی مادی زۆرتر ئەبوو، هۆیەکانی ژیان زیاتر ئەبوو، تا گەیشتە ئەوە بیر لە پاشەکەوتو دەستگرتن بـە سـەر بـەروبوومی ڕەنجـی یەکـێکی تـردا بکرێـتەوە. بـەرە بـەرە گەیشـتە ئەو ڕادەیە کە بایەخ بە موڵکدارێتیی تاکە کەسی بدرێتو ڕوخسـاری کۆمـەڵ بگۆڕدرێـتە سـەر ڕوخسـاری کۆمەڵگایـەکی چینایەتی کـاری تاکـە کەسـیو ئـاڵوگۆڕ بـوو بـە هـۆی پـەیدا بوونـی موڵکدارێتـیی تاکـە کەسـی.. دوای ئـەوەش چینەکانو چەوساندنەوە هاتـنە کایـەوە.. موڵکدارێـتی ئـاڵوگۆڕی کۆمەڵگـەی هاوبەشـی سەرەتایی بەرە بەرە لەناو چوو. شێوەی بەرهەمهێنانی تازەی –کۆیلەداری– کە یەکەمین فرماسیۆنی چەوساندنەوە بوو پەیدا بوو.

### ⋆کۆلاك - Kulak

واتـە خـاوەن دەسمایە، بەو جووتیارە لادێ نشینانە ئەڵێن کە زەویوزاری تەواویان بە دەستەوەیە، دەرامەتی ڕۆژانەی خۆی لەسەر ئـەرکی چەوساندنەوەی هـێزی کـاری ئـەم و ئـەو بەهـێز ئـەکات. واتە کرێکارە کشتوکاڵییەکان ئەچەوسێننەوە. ئەمانە جگە لە ئیشو کـاری کشـتوکاڵو ئـاژەڵداری وەکـو هـەموو خـاوەن پارەکـانی تـری لادێ خـەریکی مامەڵەو مامەڵەکاری ئەبن، وەکو "سوو" خواردنو زەوی بـە کـرێدانو بـە کرێگـرتن، نـیوەکاری، بە کرێدانی ئامێری کشتوکاڵ.. ئەمانە بە هۆی ئەمجۆرە کارانەیانەوە ئەبنە خاوەن پارەو دەسـەڵاتداری دێ.. لەگـەڵ ئەوەشـدا ژمارەیـان کەمـە، بـەڵام ڕۆڵێکی گەورە لە بواری کشتوکاڵو بەرهەمهێنانو مامەڵەو مامەڵە کاریدا ئەگـێڕن. ئەمانـە وەکـو خـاوەن زەویـوزارە زۆرەکـانو سـەرمایەدارەکان زۆر بـە بـێ بەزەیـیانە کـرێکارەکانی بەردەسـتی خۆیـان ئەچەوسێننەوە.. دیسـان لە لایەکی تریشەوە ئەمانە لەگەڵ ئەو خاوەن زەویوزارە زۆرانەو ئەو سەرمایەدارانەدا کە ئەیانەوێت جێگەیان بگرنەوە ناکۆکییان هەیەو هەمیشە مشتومڕیانە.

---

١–مادەر شاهی.

٢–پدەر شاهی– پێ ئەڵێن..

**★کاپیتالیزم - Capitalisme**

لـه وشـەی "کاپیتال"[١] لە زمانی ئینگلیزی داو بە مانای سەرمایە هاتووە، سیستمێکی ئابوورییە، کە زۆربەی بەشە ئابوورییەکانو سـەرمایەی وڵات بـە دەست چـەند کەسـانێكو ئـەو دەزگاو دامەزراوانەوەیـە کـە دەوڵـەتی نـین، ئەو دەزگاو دامەزراوە ئابوورییانە بەر بەرەکانێی چـالاکیی ئـابووریی یـەکترو قـازانجی زیاتـر ئەکـەن. ڕەوشـتی سیاسـیو ئابووریی ئەم سیستمە بە تەواوی لەگەڵ ڕەوشتو سیاسەتی سیستمی سۆشیالیستیدا ناگونجێت.. کاپیتالیزم بە مانای تەواو خاوەن سەرمایە گەورەکان ئەگرێتەوە.

**★کۆنسرواتیزم - Conservatisme**

لـە وشـەی "کۆنسـرو"[٢]ی ئینگلیزیـیەوە وەرگیراوە کە بە مانا "کۆنەپارێز–محافظ" ئەگرێتەوە. بەو کەسانە ئەوترێت لە کۆمەڵو دەوڵـەتدا ڕێـزی هـەموو یاسـاو نەریتـێکی ڕابـوردوو ئەگـرنو هـەوڵی مانەوەی ئەدەن. ئەم ڕێبازە لە بواری سیاسەتی بەریتانیادا پایەو ڕیشەی بەهێزی هەیە. ناوی "کۆنەپارێز" –کۆنسرواتیۆ– لە ساڵی (١٨٣٠–١٨٤٠) لە بەریتانیا داهات.. لەو کاتەوە ئەم وشەیە جێگەی تیۆرییەکی مێژوویی گـرتووەتەوە.. لـە سیستمی سیاسـیی بەریتانیادا حزبی کۆنەپارێز یەکێك بووە لە حزبە گەورە دەرکەوتووەکانی وڵاتو گەلێك لە گەورە پیاوانی زانای ئەو وڵاتە کاریان تیادا کردووە.

ئـەم ڕێـبازە، هەرگیز شێوازێکی فەلسەفییانەی ڕێكوپێکی نەبووە، بەڵکو ئەتوانین بەمجۆرەی خوارەوەی لێك بدەینەوە: (هەمیشە ڕووبەڕووی شۆڕشگێڕە توندڕەوەکان وەستاوە).. ئەمە گەورەترین سیفەتی ئەو ڕێکخراوەیە.

**★کۆنفیدراسیۆن-Confederation**

بـە یەکێتـیی نـێوان چەند دەوڵەتێك ئەوترێت، لە پێناوی هاریکاریو بەرگریکردن لەسەر یەکتر، بەڵام دەسەڵاتێکی ناوەندییان نییە کـە حوکـم بەسـەر دەوڵەتـە ئەندامـەکانی نـاو کۆنفیدراسـیۆنەکە دا بکات، بـەڵکو هەر دەوڵەتە بۆ خۆی لە کاروباری سیاسیی ناو خۆو دەرەوەی خۆیدا ئـازادو سەرپشکە.. وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵەکانی (١٧٧٨–١٧٨٧) بەر لەوەی شێوازی فیدراسیۆن بە خۆوە بگرێت کۆنفیدراسیۆنی بوو.

ئەڵـەمان لـە سـاڵی (١٨١٥ تا ١٨٦١)و هۆڵەندە لە ساڵی (١٨٥٠ تا ١٨٩٥) ئەمانیش کۆنفیدراسیۆنی بوون، سویسرە، ئەگەر چی بە ڕەسمـی دەوڵەتـێکی کۆنفیدراسـیۆنە، بـەڵام لـە واقـیعدا دەوڵەتـێکی فیدراسـیۆنی نییـە. وڵاتـانی ئـەندامی کۆنفیدراسـیۆن لـە بـواری پەیوەندیی نێودەوڵەتاندا هەر وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ ئەمێننەوە، بەڵام شەڕ لەناو خۆیاندا قەدەغە ئەکەن.

**★لاتیفۆندیست - Latifundiste**

بـەو کەسـانە ئەڵـێن کـە زەویوزارێکـی کشـتوکاڵییان هەبێـت، ئـەم وشـەیە بـە ڕەگـەز لاتینییەو بە مانا زەویوزارێکی فراوانی تاکە کەسێکە. ئـەم زاراوەیـە یەکـەمجار لـە سـەردەمی کۆیلەیـیدا پـەیدا بـوو. لاتـیفۆندەکانی سەردەمی کۆیلەداری یەکەمجار لە ڕۆمی کۆن دەرکـەوتن. لاتیفۆندیسـتەکان لـەو زەوی وزارە فـراوانەیاندا بـە نرخێکی هەرزانو ڕۆژانەیەکی کەم کاریان بە جووتیارەکان ئەکرد. بەرە بەرە خاوەن زەویوزارە بچووکەکانیان لە کێڵگەکانیان ئەکردە دەرەوەو زەوییەکانیان داگیر ئەکردن.

لـە پـاش لەناوچـوونی سیسـتمی کۆمەڵایـەتیو ڕژێمـی کۆیلـەداری جـارێکی تـر دیسانەوە لاتیفۆندیستەکان لە ڕۆژگاری فیوداڵیزمدا دەرکەوتنەوەو بوونە خاوەن زەویوزاری فراوانتر. تەنانەت ئێستاش[1] لە هەندێك لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا ماونەتەوە.

لاتـیفۆندەکان لـە هـەندێك ناوچـەی خـوارووی وڵاتـە یەکگـرتووەکانی ئەمریکاو ئیتالیاو بە تایبەتی لە کیشوەرە جۆر بە جۆرەکانی ئەمـریکای لاتیـندا ماونەتـەوە.. لاتیفۆندیسـتەکان ماهییەتـێکی نیمچـە فیوداڵییان هەیە.. هەندێك کۆمپانیای گەورەی ئیمپریالیستی لە وڵاتـە یەکگرتووەکاندا کە زەویوزارێکی زۆریان هەیە –بە تایبەتی لە ناوچە جۆر بە جۆرەکانی ئەمریکای لاتیندا– ئەوانە بە پێی ڕژێمی لاتیفۆندی بەڕێوە ئەبرێن. شتێکی ئاشکرایە لاتیفۆندیستەکان کۆنەپەرستانە ترین توێژی سەر بە داگیرکارانن.

**★لومپن پرۆلیتاریا - Lumpen Proletariat**

ئـەم زاراوەیـە لـە زۆربـەی بـاسو بابـەتی کۆمەڵایـەتیو سیاسـیدا ئەبینرێت. لە ڕووی زمانەوە پرۆلیتاریای سەرگەردان ئەگرێتەوە، بـەڵام مـەفهوومی ڕاسـتیو زانستییانەی بەو کەسو توێژانە ئەڵێن کە لە چینی خۆیان دوور کەوتوونەتەوە. لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا بـە زۆری لـە شارە گەورەکاندا ئەژین. ئەمانە هیچ پەیوەندییەکی چینایەتیانەیان لەگەڵ چینەکاندا نامێنێت، لە ژیانێکی ناسروشتیانەدا ئـەژین، هـیچ پیشـەو کـارێکی تایبـەتیو ئاشکرایان نییە، هیچ خزمەتێکی کۆمەڵیان پێ ناکرێت، لە هەموو هەلومەرجێکدا ژیانیان تاڵو ئـاڵۆزە.. زۆر جـار ئـەو کارانـە ئەکـەن کـە مـرۆڤ ڕەتـی ئەکاتـەوەو کـاری ناپەسـەندانە ئەکـەن وەکـو دزی، چەقۆکێشی، شـەوکوتی، خراپەکاریو..

---

١–Capital

٢–Conserve

١–کاتی نووسینی کتێبەکە–وەرگێڕ.

گەلێك لەم توێژانە لە كاتی خۆیدا كرێكار یان بۆرجوازی بچووك بوون، بەڵام ڕژێمی سەرمایەداری بە جۆرێك لێی داون و كاری تێكردوون كە گیرۆدەی ئەو بارە ناهەموارییە بوون. ئەمانە هیچ پەیوەندییەكی چینایەتییان نەماوە بە تایبەتی لەگەڵ چینی پرۆلیتاریادا. وەهیچ جۆرە پەیوەندییەكی ئایدیۆلۆجی و هاریكارییان لەگەڵ زەحمەتكێشاندا نییە.

كۆنەپەرستانی سەرمایەدار زۆر جار بۆ مەبەستی كۆنەپەرستانەی خۆیان سوود لەو عونسورانە وەرئەگرن، چونكە ئەوانە بە هەموو مانایەك دژی نەتەوەو دژی دیموكراتین. سەرمایەدارەكان ئەو كەسانە بە كرێ ئەگرن و ناشیرینترین كاریان پێ ئەسپێرن، زۆر جار بۆ سەركوتكردنی ڕاپەڕینی كۆمەڵانی خەڵك و بۆ پیلانگێڕان و ئاژاوە نانەوە بە كاریان ئەهێنن.

بۆرجوازییەكان كۆمەڵانی دەست وەشێنی فاشیستییان لەناوا دروست ئەكەن و بە كرێیان ئەگرن، لە كاتی مانگرتنی كرێكاران و ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەی خەڵكدا ئەیانكەن بە گژ كۆمەڵانی خەڵكدا. ئەوانە لە پێناوی پارەدا ئامادەن هەر كارێكی ناشیرین و نامرۆڤانە بە ئەنجام بگەیەنن.. تەنانەت كۆ لە كوشتنی پیاوی سیاسی و ئەمو ئەو ناكەنەوە.. كانگستریسمە سیاسییەكان گەلێك سوود لەوانە وەرئەگرن.

بە كورتی لومپن پرۆلیتاریا، چونكە لە باری ژیانەوە هەژارو دەستكورتن، بە هۆی ئەوەوە كە خاسییەتی چینایەتیی خۆیان دۆڕاندووە ئامادەن لە پێناوی دەرامەت و پارەدا هەر كارێك پێیان بسپێردرێت بكەن، هەر لەبەر ئەمەشە سەرمایەدارە كۆنە پەرستەكان بۆ قازانجی خۆیان بەكاریان ئەهێنن.

ڕۆژگاری سەرمایەداری بە هۆی ئەو بێكارییە درێژ خایەنەوە كە لە گەڵیایەتی ئەبێتە هۆی هەژاری خستنەوەو ئاوارەكردنی زەحمەتكێشەكان، كە ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەبێتە سەرچاوەی خولقاندنی لومپن پرۆلیتاریا، بەڵام نابێت وای دابنێین كە هەر كرێكارێك بێ ئیش بوو ئیتر ئەوە ببێتە لۆمپن پرۆلیتاریا، ئەگەر چی هەرچەندە ئەو بێكارییەشیان درێژە بكێشێت.

لۆمپن پرۆلیتاریا، تەنیا ئەو كەسانەن كە ماهییەتی پەیوەندیی چینی خۆیان دۆڕاندووە، ئەم توێژانە لەگەڵ لەناوچوونی ڕژێمی سەرمایەداریدا ئەوانیش لەناو ئەچن.

### ★ليبر اليسم - Liberalisme

ئەتوانین ئەم وشەیە بە ئازادیخواز لێك بدەینەوە، چونكە لە وشەی "لیبر" بە مانای ئازادەوە هاتووە، لەبەر باری سەرنجی سیاسییانەدا دوو مەفهوومی جیاواز لە یەكتری هەیە، لە مەفهوومێكی سیاسیدا بە كرداری سیاسییانەی بۆرجوازی ئەوترێت كە لە سەردەمی گەشەكردنیدا –لە كاتێكدا سەرمایەی سنعەتی دژی ئاریستۆكراسی‌فیودالی و لە پێناوی بەدەستهێنانی دەسەڵاتی بۆرجوازییەكاندا ڕاپەڕی– هاتووەتە دی و گەشەی كردووە، لیبرالییەكان یان ئازادیخوازەكان لەو ڕۆژگارەدا پشتگیرییان لە چینێك ئەكرد كە لە كاتی گەشەكردندا بوون و داوای ئازادیی ئابووری و كۆمەڵایەتییان ئەكرد، ئەیانویست سنوور بۆ دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دابنرێت.. ڕێگەی لیبرالەكان بدرێت بچنە پەرلەمانەوە، ڕێزی ماف و هەموو بیرو ڕایەكیان لە پەرلەماندا بگیرێت.

مەفهوومی سیایی تری لیبرالیزم، بە ڕەوشتێكی سیاسیی بێ سنووری شێوە دەروێشانە ئەوترێت لە ناو ڕێكخراوە كرێكارییەكاندا.. لەم كاتەدا بە مانا ئاشتیخواز ئەگرێتەوە كە زیان بە بنچینەی بیری شۆڕشگێڕانە ئەگەیەنێت. لیبرالیزم لەم حاڵەتەداو بەم مەفهوومە یەكێكە لە دیاردەكانی ئەپۆرتۆنیزم و ئەندیڤیدوالیزم.

### ★مۆبۆكر اسى - Mobocracy

بە مانا ئەو جۆرە دەوڵەتانە ئەگرێتەوە كە لە كەسانی نەزان و هەرچی و پەرچی پێكدێن.. ئەمانەش بە زۆری لە كاتی گێژاوی سیاسی یان كۆمەڵایەتیی هەر وڵاتێكدا ڕوو ئەدات كە سەركردەكانی ئەو دەوڵەتە كەسانی بازاڕی و لێ نەوەشاوەو هەرچی و پەرچی ئەبن. كاروباری وڵات ئەكەوێتە دەست كەسانی نەزان و لێ نەهاتووەوە.

ئەفلاتوون زۆر ڕقی لە مۆبۆكراسی[1] بووە.. هیردۆت لە یەكێك لە نووسینەكانیدا لە بارەی دیموكراتییەوە باسی مۆبۆكراسیی تیادا كردووەو وتوویەتی: *"بۆیە حەز ناكەم دیموكراسی بێتە كایەوە، ئەترسم لە ئەنجامی ئازادی و سەربەستیی بێ سنووردا مەسەلەكە بە مۆبۆكراسی بگۆردرێت"*.

### ★ماككارتيزم - Mccarthysme

ئەم وشەیە لە ناوی سیناتۆری ئەمریكایی "جوزیف ماك كارتی" یەوە وەرگیراوە، ئەم سیناتۆرە كۆنەپەرستە ئەمریكاییە نوێنەرایەتیی هارترین كۆمەڵی ئیمپریالیستی و جەنگی سارد و سەرۆكی كۆمیسیۆنی لقی لێكۆڵینەوەی ئۆرگانە دەوڵەتییەكانی ئەمریكایی كە لە ساڵی (١٩٥١) دامەزرا گرتبوویە ئەستۆی خۆی. لە ژێر ناونیشانی "چالاكی نواندن دژی ئەمریكایی" سوودی لە دڕندەترین شێوازی ئازاردان و سەركوتكردنی ئازادیخوازان و لێدانی ڕێكخراوە پێشكەوتنخوازەكان وەر ئەگرت.

---

١–Mobocracy

ماك كارتیزم، بە كرداری هەڕەشەكردنو كوشتنو ڕفاندنو بوختان سازدانو فایل دروستكردن، ئەڵێن لە پێناوی سەركوتكردنی تاكە كەسو كۆمەڵو ڕێكخراوە پێشكەوتنخوازەكاندا.

ماك كارتیزم، ڕواڵەتی كرداری بە فاشیستی كردنی ژیانی كۆمەڵایەتیو سیاسییە، بەو كەسانە ئەڵێن كە هەمیشە هەوڵ ئەدەن مافی دیموكراتیو ئازادییە دیموكراتییەكان بخنكێنن.

## ★ماكیاڤیلیسم - Machiavelisme

ئەم زاراوەیە لە ناوی "ماكیاڤیللی[٢]" نووسەرو سیاسەتزانی ئیتالیایی وەرگیراوە، كە لە كۆتایی سەدەی پازدەیەمو سەرەتای سەدەی شازدەیەمدا ژیاوە. ئەو ئامۆژگاریی دەسەڵاتدارانی ئیتالیای كردووە كە لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجی خۆیاندا كۆ لە هیچ خراپەكارییەك نەكەنەوە.. وشەی ماكیاڤیلیزم بە مانای ئەو سیاسەتو ڕەوشتەیە كە لە پێناوی بە ئامانجدا لە هیچ شتێك لانەداتو هەموو ڕێزێكی ئەخلاقیو مرۆڤایەتیو ڕێزو گەورەیی بكات بە ژێر پێوە.

بە واتایەكی تر ماكیاڤیلیزم مانای پشتگوێ خستنی هەموو یاساو نەریتو عورفو عادەتێكی كۆمەڵو پێشێلكردنی ویژدانو ڕاستیو دادپەروەرییە لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجدا.

## ★ماڵتۆسیانیسم - Maltusianisme

ئەم وشەیە لە ناوی قەشەی ئینگلیزی "ماڵتۆس" ەوە وەرگیراوە، كە لە كۆتایی سەدەی هەژدەیەمو سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا ژیاوە.. تیۆرییەكەی تیۆرییەكی بۆرجوازییانەی زۆر كۆنەپەرستانەیە، ئەو وتوویەتی كۆمەڵگەی ئادەمیزاد زیاد لە ڕادەی گەشەكردنی كەرەستەی خۆراك گەشە ئەكاتو زۆر ئەبێت، ئەمەش ئەو ئەنجامە هەڵەیە ئەدات بە دەستەوە كە كۆمەڵانی خەڵك دووچاری مەترسیی برسێتیو هەژاری ئەبن. وە بەڵگەی ئەمەیە گوایە زاوو زێكردنی زۆر ئەبێتە هۆی دەستكورتیو برسێتی.

ئەوانەی لایەنگری تیۆرییەكانی "ماڵتۆس"ن چاویان ڕژێمی كۆمەڵایەتیی تازەو هۆیەكانی بەرهەمهێنان نابینێتو باوەڕیان بە ڕۆڵی گرنگی زانستو تەكنیكو دەستكەوتەكانیان نییە.

تۆریزانەكان، بە زۆری بەرپەرچی ئەم تیۆرییە كۆنەپەرستانەیان داوەتەوە. لەم ڕۆژگارەی دواییدا[١]، هەندێك لە كۆمەڵ شوناسانی ئەمریكاییو ئینگلیزی هەوڵی ئەوەیان داوە ئەم تیۆرییە زیندوو بكەنەوەو بە تیۆری "نیو ماڵتۆسیانیزم" سیاسەتی ژێر دەستە كاری دەوڵەتە ئیمپریالیستییەكان بەهێز بكەن. ئەوانە تەنانەت جەنگە تالانكارییەكان بە هۆیەك لە پێناوی چارەسەركردنی باری گوزەرانو پێشخستنی باری ئابووریو كۆمەڵایەتی دائەنێن، چونكە خەڵكێكی زۆر لە ناو ئەچنو بە پێی باری سەرنجی ئەوان ئیتر باری گوزەران خۆش ئەبێت.

ئەم تیۆرییە ماهییەتێكی كۆنەپەرستانەو دژی مرۆڤایەتیی هەیە. لە ڕاستیدا هەژاریو دەستكورتیی زەحمەتكێشان لە ڕژێمی سەرمایەداریدا، بە هۆی جەنگی ئیمپریالیستییانەو داگیركردنی وڵاتانو شەڕی ناڕەواوە ڕوو ئەدات.. ئەوانەی تیۆریی ماڵتۆس پەسەند ئەكەن قسەكانیان بێ بناغەیەو هیچ بنچینەیەكی زانستییانەیان نییە.

تاقیكردنەوەی مێژوویيو زۆربوونی خەڵك شان بە شانی بە پەلە چاكبوونی باری ژیانو گوزەرانی خەڵك لە وڵاتە پێشكەوتووەكاندا پووچەڵیی ئەمجۆرە تیۆرییانە ئەسەلمێنێت.

## ★مانیفێست - Manifeste

ئەم وشەیە كە بە مانای ڕاگەیاندراو، پەیام، باری سەرنجو.. لێكدراوەتەوە چەند مەفهوومێكی جۆر بە جۆری هەیە، بەهادارترین مەفهوومیان پەیامی درێژو دەرخستنی شێوازی بیرو باوەڕ ئەگرێتەوە، كە لە لایەن دەزگا یان ڕێكخراوێكی سیاسی یان چەند ناودارو ڕێكخراوی ئەدەبیو هونەرییەوە بڵاو بكرێتەوە.

لە هەر مانیفێستێكدا مەرامو بەرنامەی كاركردنو نەخشەو پێشنیاری هەمەجۆرە نیشان ئەدرێت.

زۆرجار مانیفێست لە لایەن كۆمەڵێك هونەرمەند یان نووسەرەوە بڵاو ئەكرێتەوە، كە ڕازو نیازو مەرامو ویستی ئەو دەستەو كۆمەڵەی تیا بە دیار ئەكەوێت. زۆر جار دەوڵەتێك یان ڕێكخراوێك نیازو نەخشەكانی خۆی بە ناوی مانیفێستەوە نیشان ئەدات.. لە كاتی هەڵبژاردنیشدا بە زۆری مانیفێستی هەڵبژاردن بڵاو ئەكرێتەوە.. لە زۆر كاتیشدا وشەی مانیفێست بە مانای نووسراوێكی سیاسی یان بەڵگەی پێ ڕاگەیاندن كە ئامانجی مەسەلەیەكی تایبەتی بێت لەناو خەڵكدا بڵاو بكرێتەوە ئەگەیەنێت.

## ★مەترۆپۆڵ - Metropole

بە وڵاتە ئیمپریالیستییە خاوەن موستەعمەرەكان ئەڵێن.. دەزگا ئینحیسارییە گەورەكانی كیشوەرە مەترۆپۆڵییەكان بە هێزی داراییو سنعەتیی خۆیان سوودێكی زۆر لە تالانكردنی ناوچە ژێردەستەكانیان وەرئەگرن، وەكو ئیشكردنی هەرزان بە خەڵكی وڵاتە

---

٢- Machiavele

١- بە نیسبەت سەردەمی دانانی كتێبەكەوە-وەرگێڕ.

ژێردەستەکان، زۆریی سەرچاوە سروشتییەکانو هەرزانبوونی نرخی کەرەستەی خاو، خستنەکاری دەست مایەو پارە لە وڵاتە ژێردەستەکاندا.

بەم هۆیانەی سەرەوە وڵاتە مەترۆپۆلییەکان سوودێکی زۆریان پێ ئەگات، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە بە ئاشکرا خەڵکو سامانی خەڵک لەو وڵاتە ژێر دەستانەدا تاڵان ئەکەن، کیشوەرە ژێردەستەکان ئەکەنە کێڵگەو کانی کەرەستەی خاوی خۆیان.

### ⋆میللیکردن - Nationalisation

میللیکردن بەوە ئەڵێن زەوی، بانقەکان، هۆیەکانی بارکردنو گواستنەوە، کارخانەکان، دەزگاو دامەزراوە جۆر بە جۆرەکان، دەزگا بازرگانییەکانو هەموو هۆیەکانی بەرهەمهێنان لە موڵکداریتیی تاکە کەسی یان کۆمپانیاو دەزگا تایبەتییەکان دەربهێنرێنو هەموو ببنە موڵکی دەوڵەت.

بەم پێیە مەفهوومی میللیکردن بریتییە لە ڕەتکردنەوەو لەناوبردنی یاسای موڵکداریتیی تایبەتیو کۆمپانیا تایبەتییەکان لە ناوەوەو دەرەوە، کە ئەو کۆمپانیاو خاوەن دەزگایانە لە کارخانەو دەزگاکانی خۆیاندا خەڵکی تیا ئەچەوسێننەوە.. کاتێك باسی میللیکردن ئەکەین واتا ڕزگاربوون لە دەست کۆمپانیاکانی بێگانەو کردنی کۆمپانیاکان بە موڵکی دەوڵەت.. کاتێك ئەڵێن میللیکردنی بازرگانیی دەرەوە واتە هەموو مامەڵەو مامەڵەکارییەکی بازرگانی دەرەوە بە دەستی دەزگاو دامەزراوەکانی دەوڵەت بسپێردرێت.

لە دوای لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی وشەی میللیکردن دێینە سەر باسکردنی ماهییەتو سروشتی میللیکردن.. لە کاتێکدا کە دەوڵەت خۆی خاوەنی خەصڵەتی چینایەتیانە بێت، یان لە هەر کۆمەڵگەیەکی چینایەتیانەدا ناتوانین مەسەلەی میللیکردن لە دەرەوەی سروشتی چینایەتیی دەوڵەت ڕەچاو بکەین.

بەمجۆرە ئەوەمان بۆ دەر ئەکەوێت کە مەسەلەی میللیکردن تەنیا مەسەلەیەکی ئابووریی نییە، بەڵکو بەشێکی گرنگیشە لە مەسەلە سیاسییەکانی وڵات.

لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا مەسەلەی "میللیکردن"ی دەزگاو دامەزراوەکان هێشتا ئەو مانایەی بە خۆوە نەگرتووە کە دەزگاو دامەزراوە میللی کراوەکان ئەبنە موڵکی گەل، لەبەر ئەوەیە، چونکە دەوڵەت لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا دەوڵەتی تەواوی خەڵك نییە. لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا میللیکردن هەموو کەلێنو قوژبنەکانی چەوساندنەوە بنەبڕ ناکاتو هۆی تازەی بەرهەمهێنانو شێوەو ڕوخساری تازەی بەرهەمهێنان ناهێنێتە دی.

میللیکردن هەندێك جار ئەبێتە هۆی سنوورکێشان بە دەوری دەسەڵاتی خاوەن دەزگا ئینحیسارییەکانداو هەندێك جاریش ڕوخساری سەرمایەداریی دەوڵەت بەهێز ئەکات.. چەند نموونەیەك هەیە کە سەرمایەدارەکان لە بارەی میللیکردنەوە بەکاری دێنن بۆ فرۆشتنی کارخانەو چەرخو ماشینی کۆنی دەزگاو دامەزراوەکانی خۆیانو تازەکردنەوەی هەموو ئەمانە لەسەر ئەرکی دەوڵەتو بودجەی گشتی..

لە کاتی دەسەڵاتی کۆمەڵانی خەڵكو ڕاپەڕینی زەحمەتکێشاندا میللیکردن بە پێی ویستو داخوازییە بنچینەییەکانی خەڵك دەسەڵاتی سەرمایەداران دیاریی ئەکاتو سنووریان بۆ ئەکێشێت. وەکو میللیکردنی هەندێك دەزگاو دامەزراو لە فەرەنسە لە دوای ئازادبوون لە ژێر نیری فاشیستیو سەرکەوتنی بەسەر هیتلەرییەکاندا.

لەم ڕۆژگارەی ئێستادا، لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا دەزگا ئینحیسارییە سەرمایەدارییەکان دوژمنی هەرە گەورەی چینی کرێکارانو تەنانەت دوژمنایەتیی جووتیاران، پیشەکاران، سەرمایەدارە بچووکەکان، زۆربەی کاربەدەستانو ڕۆشنبیرانو تەنانەت هەندێك سەرمایەداری مامناوەندیش ئەکەن.. کرێکاران دەستی توندی خۆیان لە دەزگا ئینحیسارییەکانی سەرمایەداران ئەوەشێننو هەموو توێژەکانی کۆمەڵ کە لەناوچوونی سەرمایەداری بە قازانجی خۆیان ئەزانن لە دەوری خۆیان کۆ ئەکەنەوە.. پرۆلیتاریا ئەو جۆرە میللیکردنەی ئەوێت کە بە قازانجی تێکڕای کۆمەڵانی خەڵك بێت، وە ئەمە بەشێکە لە بەرنامەی کاری پرۆلیتاریا دژی سەرمایەداران.

میللیکردن لەو وڵاتەی لە کاتی گەشەکردندان ئەهمییەتێکی تایبەتیی ژیانی هەیە، میللیکردنی دەزگاو دامەزراوە ئینحیسارییەکانی سەر بە دەرەوە پایەی بنچینەیی دەست بەسەردا گرتنی بازرگانیی دەرەوە ئەڕووخێنێتو دەستەبەری سەربەخۆیی ئەکات. کەوابوو میللیکردن کارێکی گورچکبڕانەی دژ بە ئیمپریالیزمە.. کە ڕێگەی گەشەکردنی ئابووریی دواکەوتووی وڵاتە ژێردەستەکان ئەکاتەوەو دەرگای سەربەخۆیی ئابووریی بۆ هەموویان ئەخاتە سەر گازی پشت.

لە سەردەمی ئەمڕۆماندا، سەردەمی گۆڕینی سەرمایەداری بە سۆشیالیستی، لەو سەردەمەدا کە ڕاپەڕین لە پێناوی گەشەکردنی ئابووریی نەتەوایەتییانەو سەربەخۆکردنی ئابووریی وڵاتو ڕاپەڕین لە دژی مۆنۆپۆلەکان ڕۆڵێکی گرنگ دیاریی ئەکات، هەر لەو کاتەدا مەسەلەی میللیکردن ئەهمییەتێکی تایبەتیی خۆی هەیە.. لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا چ پێشکەوتوو بن یان لە حاڵەتی گەشەکردندا بن، ئەم مەسەلەیە بە تەواوی لەگەڵ مەسەلە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵکدا تێکەڵە.

لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا دەوڵەت هەمیشە هەوڵی ئەوە ئەدات سەرچاوە دەوڵەتییەکان لە پێناوی خزمەت بە سەرمایەدارانو بەر لە هەموویان خزمەتی دەزگا ئینحیسارییەکانی پێ بکات.

### ⋆میلیتاریسم - Militarisme

بریتیـیە لـە سیاسـەتی دەوڵەتـە سـەرمایەدارییەکان، کە لەسەر توندوتیژیی‌و حوکمی عەسکەری بەڕێوە بروات.. سوود وەرگرتن لە هێزی سـەربازی لـەناو کاروبـاری سیاسیی‌و خـۆ ڕێکخسـتنی شـەڕی داگیرکارانـە، لە ئەنجامی کرداری میلیتاریستانەدا، کار ئەگاتە ئەو ڕادەیـە کۆنەپەرسـت تـرین‌و دەسـت درێژکـار ترین عونسوری سەرمایەی ئینحیساری دەست بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی‌و سیاسیی وڵاتدا بگرێت.

لـە ڕووی بەرهەمهێـنانەوە، ئەگـەر دەسـتی میلیتاریستانە بکەوێتە ناو شێوازی بەرهەمهێنانی چەک‌و قۆرخانەی جەنگییەوە ئەوا بە ڕادەی پێشـکەوتنی بەرهەمهێـنانی کەرەسـەی جـەنگی ئەوەندە بەرهەمهێنانی کەلوپەلە سنعەتییەکانی تر کەم ئەبێتەوە، تەنانەت زۆر جـار ئەکەوێـتە مەترسـیی بـە یـەکجاری لەناوچـوونەوە. لـە ئـەنجامی بە سەربازیکردنی ئابووری، باری گوزەران‌و ژیانی زەحمەتکێشان نـاخۆش ئەبێـت، چـونکە زۆربـەی سەرچاوە دەرامەتییەکانی وڵات بۆ کەرەسەی جەنگی‌و چەک‌و جبەخانە تەرخان ئەکرێت، ژمارەیەکی کەمـیان بـۆ جێبەجێکردنی بـواری ئـاوەدانی‌و کۆمەڵایـەتی ئەمێنێـتەوە. کـرێی ڕۆژانـە کـەم ئەبێتەوەو توانای کڕین زۆر لاواز ئەبێت.. سـەرمایەدارەکان بـۆ زیاتر چەسپاندنی حوکمی خۆیان‌و لەناوبردنی ناکۆکیی کارەکانیان زۆر جار پەنا ئەبەنە بەر میلیتاریزم، بەڵام ئەم کرداره ئەبێـتە هۆی زیاتر توندو تیژکردنی ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵ‌و هێنانەدیی ناکۆکیی تازە لە منداڵدانی ڕژێمی سەرمایەداریدا. ئەم سیاسـەتە شـان بە شانی دەسەڵاتی دەزگا ئینحیسارییەکان‌و هەوڵ‌و تەقەللای دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکان دژی وڵاتانی سۆشیالیست‌و ڕاپەڕینی ئازادیخوازانەی گەلی فراوان ئەبێت.

سـەرمایەدارە ئینحیسـارییەکان دەوڵـەتی میلیتاریسـتی بـە شێوەیەکی بێ وێنە بەهێز ئەکەن. میلیتاریزم کە ئەبێتە هۆی زۆربوونی سـامانی کۆمەڵـە تایبەتیـیە بۆرجوازیـیەکان لـە هـەمان کاتدا ماڵوێرانی‌و گرانی‌و ئاڵۆزیی دارایی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا دروست ئەکات‌و جیهانی ئادەمیزاد لە بەردەم شەڕێکی گەورەی گیان سووتێنەرانەدا ڕا ئەگرێت.

ڕاپەڕیـنی زەحمەتکێشـان لـە دژی میلیتـاریزم‌و مـەخارجی جـەنگی‌و دەسـت تـێوەردانی سەربازی بۆ ناو کاروباری ژیانی سیاسی‌و کۆمەڵایـەتی بەشـێکە لـەو ڕاپەڕیـنە گشتییەی کە لە سەرتاسەری وڵاتە ڕاپەڕیوەکاندا دژی دەزگا ئینحیسارییەکان‌و داگیرکاران ئەکرێت لە پێناوی ژیانی ئاشتی‌و سەقامگیر بوونی سۆشیالیزمدا.

### ★نازیزم -بە ئەڵەمانی ناتسیزم- Nazism

زاراوەیەکـە، بـە زۆری بـەو تـیۆری‌و شـێوەی حکومـەتی ئەڵەمانـیان ئـەوت لـە ڕۆژگـاری ئـادۆڵف هیـتلەردا، هـەندێك جـاریش بـەو ڕژێمانـەیان ئـەوت کـە لـە فاشیسـتییەتی ئەڵـەمان ئەچـوون. وشـەی نـازی[1] ناونیشـانی کورتکـراوەی "حزبی ناسیۆناڵ سۆشیالیستی کرێکارانی ئەڵەمان"ە–"National Sozialis Tische Deut sche Arbeiterpartei"..

ئەم حزبە کە لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی دامەزرا، لە ساڵی (١٩٣٣–١٩٤٥) حوکمی سەرتاسەریی وڵاتی ئەڵەمانی ئەکرد.

بنچینەی تـیۆریی ئـەم حـزبە لـە فاشیسـتییەتی ئیتالـیاو بیروبـاوەڕی ناسیۆنالیسـتییانەی کۆنـی ئەڵـەمان‌و چەندان تیۆری ڕەگەز پەرسـتانەو یاساو نەریتی میلیتایستیی پروسی پێکهاتبوو. بەرنامەی کاریان ئەوەبوو ئەڵەمانێکی میلیتاریستیی بە دەسەڵات پێکبهێنن کە بتوانێـت سـنوورەکانی خۆی فراوان بکات‌و یەکێتیی ئەڵەمانی زمانەکان دابمەزرێنێت‌و دابینی بکات.. ڕەوشتی حکومەتەکەی توندو تـیژترین جـۆری دیکتاتۆری‌و توتالیتریزم بوو. سوودێکی زۆری لە پڕوپاگەندەو کاری زۆرە ملیّ ئەکرد. "حزبی ناسیۆناڵ سۆشیالیستی کرێکارانی ئەڵـەمان" کـە لـە دواییدا ناونیشـانی کـورت کراوەکەی "نازی" بوو لە ساڵی (١٩٢٠) لە میونیخ دامەزرا. ئادۆڵف هیتلەر کە ڕابـەرو سـەرکردەی حـزبە کـە بـوو لـە سـاڵی ١٩٢٣ لە پاش کودەتایەکی لە ناکاو دەسگیرکراوە خرایە بەندیخانەوە. لە زینداندا کتێبی "شەڕی من"ی دانا، کە لە دواییدا بوو بە کتێبێکی گرنگ‌و پەیڕەویی ناوخۆی نازییەکان.

نازیـزم، ڕاپەڕینـێك بـوو بـۆ سـەر لـە نـوێ دامەزراندنـەوەی دەسـەڵات‌و هەیـبەتی ئەڵـەمان‌و لەناوبـردن‌و سـڕینەوەی شـوێنەواری تێکشـکاندنی ئەڵـەمان لـە یەکەمین شەڕی جیهانیدا. ژمارەیەکی زۆر سەربازو ئەفسەرو چینە ناوەندییەکان‌و هەندێك لە سەرمایەداران‌و خـاوەن بانقـەکان کـە لـە سۆشـیالیزم ئەترسـان، ئەمانـەی هـەموو لـە دەوری خـۆی کۆکـردەوە. دروشـمی ناسیۆنالیسـتە نازیـیەکان تێکشـکاندنی ئەڵـەمانی لـە شـەڕی یەکـەمدا خسـتە ئەسـتۆی، مارکسیسـتەکان، لیـبراڵ دیموکراتەکان، کـاثولـیکەکان.. بـە تایـبەتی جولەکەکان.

حزبی نـازی تـا سـاڵی (١٩٣٠) هـیچ جـۆرە ئەهمییەتـێکی نـەبوو، بـەڵام لـە دوای گـێژاوی ئـابووری بـە پەلـە گەشـەی کرد، بوو بە گەورەتـرین‌و کوێرانەتـرین هێزی سیاسیی ئەڵەمان. دوای ئەوە "هیندنبورگ" سەرکۆماری ئەڵەمان لە ساڵی (١٩٣٣)دا هیتلەری کرد بە سـەرەك وەزیـران.. هیـتلەر لـە مـاوەی چـەند مانگێکدا تـەواوی حـزبە سیاسـییەکانی تـری ئەڵـەمانی قەدەغەکردو حزبی نازی بوو بە یەکـەمین حـزبی سیاسـیی ئەڵەمانـیا. ڕەخنـەگرتن بـە تـەواوی لـە ئـارادا نـەما، ئەوانەی سەرپێچییان ئەکرد بە زۆر ئەیان ناردن بۆ ناو ئۆردوگا زۆرە ملێکانی کار پێکردن، وەیان دوور ئەخرانەوە، تیۆرییەکانی نازی کارییان پێ ئەکرا.

سیاسـەتی فـراوانخوازیی نازیـیەکان بـوو بـە هـۆی هەڵگیرسـاندنی دووەمـین شـەڕی جـیهانی‌و حکومـەتی نازی لە ساڵی (١٩٤٥) دا ئەڵەمانیای دۆڕاندو گەلێك لە سەرکردەکانی حزب‌و دەوڵەت بە ناوی تاوانباری جەنگ‌و دژی ئادەمیزادەوە دران بە دادگا لە نۆرمبێرگ.

بنچینەی فەلسەفەی نازیزم لە چەند تیۆرییەك پێکهاتووە کە لە ماوەیەکی کەمدا یەکانگیربوون. لە واقیعدا گەشەکردنێکی سیاسیی مـێژوویی نـەبوو.. گـرنگترین شـێوازی نازیـیەکان کـە لـە فاشـیزمی ئیتالـیا ئەچوو تیۆری ڕەگەز پەرستانە بوو کە بە پێی ئەو تیۆرییە ڕەگەزی ئەڵەمان ئەبێت بەسەر هەموو ڕەگەزەکانی تری جیهاندا حوکمڕەوا بێت.

---

Nazi–١

وه هیتلەر ئەم تیۆرییەی بە یاسایەکی نوێی جیهانی دا ئەنا. حزبی سۆشیالیستی ئەڵەمان لە واقیعدا نە ناسیۆنالیست بوو نە سۆشیالیست، چونکە لە لایەنی یەکەمەوە بڕوای بە سەرکەوتنی یەك ڕەگەز بوو نەك نەتەوەکان. لە لایەنی دووەمیشەوە هەرگیز هیچ جۆرە سنعەتێکی میللیی نەکرد، بەڵکو تەنیا دەستکاریی کاروباری ئابووریی ئەکرد لە بواری پێداویستییەکانی جەنگو لەشکردا. ئایدیۆلۆجیی نازی دەوڵەت بە دەسەڵاتێك دائەنێ کە ڕێگەی ڕەخنەگرتنی خەڵکیی لێگیرابێت. لەبەر ئەوە دیموکراتیو لیبرالیزمی دوور ئەخستەوەو ئارەزووی خەڵکی بە بەشێك لە ئارەزووی دەوڵەت دائەنا.

نازیزم قارەمان پەرستیی ئەکردو بە شانو باڵی دەسەڵاتو جەنگی سەرکەوتووانەدا هەڵی ئەدا، پەیوەندییەکانی کۆمەڵگەی ئادەمیزادی بە بەشێك لە یاسای "تەنازوعی بەقا" ئەزانیو ئاشتیی درێژخایەنی بە دواکەوتنو نابووتی دائەنا.. نازیزم باوەڕی بە ناکۆکیی چینایەتی نەبووەو دوژمنی هەموو بیروباوەڕێکی پێشکەوتنخوازانە بوو.

**★ناسیۆنالیزم - Nationalisme**

لە وشەی "ناسیۆن" کە بە مانا نەتەوە ئەگرێتەوە وەرگیراوە، مەفهوومی نەتەوە پەرستییەکی کوێرانە ئەگەیەنێت، نابێت ئەمە بە نیشتمان پەرستیو داکۆکی لەسەر مافی نەتەوە حیساب بکەین. لەم مەفهوومەدا ناسیۆنالیزم یەکێکە لە لە شێوازی ئایدیۆلۆجیو سیاسەتی بۆرجوازی. ناوەڕۆکەکەی بریتییە لە نەتەوەی خۆ بە زل زانینو بە سووك تەماشا کردنی تەواوی نەتەوەکانی تر.

ناسیۆنالیزم لە کاتی پەیدابوونی نەتەوەدا لە کۆمەڵگەی بۆرجوازیدا پەیدا بووەو لەگەڵ گەشەکردنی سەرمایەداریدایە.. ئەم ئایدیۆلۆجییە لە کاتی سەر بەرزکردنەوەی سەرمایەداریو ڕاپەڕین دژی فیوداڵیزم ڕۆڵێکی گەوری دیاریکردووە، لە بارەی هۆشیاریی نەتەوەییو دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییەوە دەورێکی کاریگەرانەی هەبووە.

**ناسیۆنالیزم دوو ڕوخسار نیشان ئەدات:**

**یەکەم:**

لای نەتەوە ئازادو دەسەڵاتدارەکان وەکو شۆڤێنیزم کە تەنیا نەتەوەی خۆیان بە باش ئەزانن‌و لە پێش هەموو نەتەوەیەکەوە دای ئەنێنو مافی هەموو نەتەوەکانی تر ڕەت ئەکەنەوەو ئەیانەوێ نەتەوەکانی تر لە ناو خۆیانا بتوێننەوە، سەیر ئەکرێت.

**دووەم:**

لای ئەو نەتەوانەش کە ژێر دەستەن وەکو ناسیۆنالیزمی ناوچەیی کە پشت بە کەسی تر نابەستنو تەنیا خۆیان بە نەتەوە دائەنێنو ئارەزوویان جیابوونەوەیە.. تەماشا ئەکرێن.

بلوێر ژەنەکانی بۆرجوازیو ڕیفۆرمیستەکان هەوڵ ئەدەن بە ناوی "قازانجی گشتیی نەتەوە"و هاندانی ناسیۆنالیزمو بانگەوازی نەتەوە پەرستیی کوێرانەو جیا خوازییەوە هۆشیاریی چینایەتیی زەحمەتکێشان کەم بکەنەوەو کەلەبەر بخەنە ناو ڕاپەڕینی جەماوەری خەڵکەوەو سەرنجی خەڵك بەرەو شەڕی ئیستیعماریو داگیرکەرانە ڕابکێشن.. ناسیۆنالیزم لەگەڵ قازانجی زەحمەتکێشانو بەرژەوەندیی واقیعی نەتەوەدا ناگونجێت.

لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا کاتێك کە یەکسانیی تەواو لە نێوان نەتەوەکاندا ئەچەسپێت، هەموو زەمینەکانی کۆمەڵایەتیو ئابووریی ناسیۆنالیزم لە ئارادا نامێنێت، بەڵام ڕواڵەتێکی لاواز وەکو پاشماوەی ڕژێمێکی کۆنی سەرمایەداری لەناو بیروکرداری هەندێك کەساندا ئەمێنێتەوە، چونکە کاریگەرێتیی دەوری ناسیۆنالیزم لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا بە ئاسانی لەناو ناچێت.

تیۆری شۆڕشگێڕانە هەمیشە شێوازی ئەنتەرناسیۆنالیستی پرۆلیتاری بەرامبەر ناسیۆنالیزم داناوە، چونکە زەحمەتکێشان لە ڕێگەی جێبەجێ کردنی یەکێتیی سیاسەتو ئایدیۆلۆجیی ئەنتەر ناسیۆنالیستیی پرۆلیتارییەوە ئەتوانن لە نیری چەوساندنەوە ڕزگاربن.

دەزگا ئیمپریالیستیەکان هەمیشە هانی ناسیۆنالیستی کۆنەپەرستانە ئەدەن لە وڵاتە گەشەکردووەکاندا، بۆ ئەوەی ناکۆکی لە نێوان نەتەوەکاندا بنێنەوەو ئەو ناکۆکییانە بکەنە گورزی دەستیان بۆ لێدانی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی گەلیو سەرکوتکردنی ڕێبازی هێزە شۆڕشگێڕەکان.

ناسیۆنالیزم، ڕوخسارێکی ئاندیڤیدوالیسمانەی خۆ پەرستانەیە کە پەیوەندیی بە بۆرجوازیو وردە بۆرجواوە هەیە.. کە پڕیەتی لە لەخۆ باییبوونو بە کەمی سەیرکردنی کەسانی تر.

**★نیو ئیستیعمار، یان ئیستیعماری نوێ - Neocolonialisme**

لە سەردەمی لەناوچوونی سیستەمی وڵاتە ژێر دەستەکانی ئیمپریالیزمدا، بەرامبەر ڕاپەڕینی ئازادیخوازانەی نەتەوەییو داواکردنی سەربەخۆییدا، لەو کاتانەدا کە ئیتر ئیمپریالیزم ئەو هیوایەی نامێنێت وەکو جاران وڵاتان ژێردەستە بکات، واتە دەسەڵاتی تەواو ئاشکراو سیاسەتی ئابووریو سەربازیی خۆی بە سەریاندا بسەپێنێت، ناچار ئەبن بۆ ئەوەی جارێکی تر دەسەڵاتی سیاسیو ئابووریو سەربازیی خۆیان لە وڵاتاندا بچەسپێننو ئایدیۆلۆجییەتی خۆیان بڵاو بکەنەوە دەست بدەنە جۆرە کردارێکی ترو شێوازو ئوسلوبی تازە بەکار بێنن، تاکو بە ئەنجامی خۆیان بگەن. ئەم نیازانەیان لە ڕووی ماهییەتەوە ماهییەتێکی ئیستیعمارییانەیان هەیە، بەڵام شێوازەکانیان تازەن. لەگەڵ شێوازی ئیستیعماری کۆندا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمو سەرەتای سەدەی بیستەمدا جیاوازە.. لەبەر ئەوە ئەمەیان پێی ئەڵێن "ئیستیعماری نوێ" یان ئیستیعماری تازە. لە هەمان کاتدا کە ئیمپریالیزم پەنا ئەباتە بەر شێوازی ئیستیعماری تازە، ئا لەو کاتەدا نیشانەی تێکشاندنی هەموو جۆرە سیاسەتێکی ئیمپریالیزمە لە جیهاندا.

***ئەم شێوازە تازانەی ئیمپریالیستەکان چییە؟***

گەورەترینیان ئەمانەن:

*١–دەسەڵات سپاردن بە چەند دەستەو کۆمەڵێکی ناوخۆیی کە هەر یەکەیان بە جۆرێك پەیرەویی سیاسەتەکانی ئیمپریالیزم بکاتو لەسەری برواتو پەنا بەرنە بەر پیلان نانەوەو کودەتاو تیرۆرو ئەمجۆرە شتانە.*

*٢–گەورەترین چەرخو دەزگای سنعەتییان بە دەستەوەبێت، بازرگانیو کشتوکاڵ بخەنە ژێردەست خۆیانەوە ئەویش بە هۆی دانانی دەسمایەو دەستگرتن بەسەر ڕێگەی سەرمایەدا، قەرزو قۆڵەدان، بەڕێوەبردنی سیاسەتی بەناو یارمەتیدانو زۆرهێنان بۆ ئابووریو دەسەنە خۆر کردنی کۆمەڵە دەسەڵاتدارەکان.*

*٣–ئاڵوگۆڕی بازرگانی بە شێوەی نا بەرامبەر کە بەرهەڵستیی گەشەکردنی ئابووریی وڵات بوەستێتو وڵات وەکو بازاڕێکی کەرەسەی خاوی هەرزان بهێڵێتەوە.*

*٤–دامەزراندنی بانقو کۆنسرنو دەزگای ئابووریی تر کە لە ناو دەوڵەتدا دەوڵەتانە ڕەفتار بکەن، جڵەوی ئابووریی وڵاتیان بە دەستەوە بێت وەکو: کۆنسرسیۆمی نێونەتەوەیی نەوتو بانقی فراوانکردنی سنعەتیو کانەکانو..*

*٥–بەستنی پەیمانی نابەرامبەری لەگەڵ هەلومەرجی گرانو ژێردەستە کردنی سیاسیو لەشکریو ئابووری.*

*٦–ڕاکێشانی وڵاتەکان بۆ ناو پەیمانی سەربازیی دوو لایەنە، یان ناوچەیی وەکو پەیمانی ئەوسای "سەنتۆ" و ڕێککەوتننامەی دوو لایەنیی نێوان ئێرانو ئەمریکا.*

*٧–سوود وەرگرتن لە دەزگاو دامەزراوە بەناو ڕۆشنبیرییەکانو چاپەمەنیو خێرخوازیو هاریکاریو ئەمجۆرە شتانە.*

*٨–هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەو ڕاکێشانی بۆرجوازییە نیشتمانییەکانو سوود پێ گەیاندنیان لە بواری بەکارخستنی سەرمایەکانیانداو ڕاکێشانی هەندێك لە توێژەکانی تری کۆمەڵ بە مەبەستی بەهێزکردنی پشتیوانیی کۆمەڵایەتیی خۆی.*

*٩–سوود وەرگرتن لە دووبەرەکایەتی نانەوەو شەڕو ئاژاوە نانەوەو جیاوازیی خستنەوە لە نێوان هێزە ئازادی خوازە نیشتمانییەکاندا.*

*١٠–سود وەرگرتن لە هەموو دژایەتییەکی ڕێبازی پێشکەوتووانە بە چەندان شێوەی جۆر بە جۆر..*

ئیمپریالیزم، بۆ بەرگرتن لە جووڵانەوەی ئازادیخوازانە لە لایەکەوە زۆر بە توندی داکۆکی لەسەر پاشماوەکانی ئیستیعمار ئەکاتو لە لایەکی تریشەوە بە شێوەی ئیستیعماری تازە تێ ئەکۆشێت، کە ڕێگەی گەشەکردنی ئابووریو کۆمەڵایەتی لە وڵاتە تازە گەشە کردووەکان بگرێت. ئەو وڵاتانەی کە سەربەخۆیی نیشتمانییان سەندووە. هەروەها داکۆکیی لەسەر هەموو بارو نەریتێکی کۆنەپەرستانە ئەکاتو ڕێگە نادات ڕژێمە کۆمەڵایەتییە دواکەوتووەکان لەناوبچنو هەوڵ ئەدات کۆسپ لە ڕێگەی پێشکەوتنو گەشەکردنی وڵاتدا دروست بکات.

ئیمپریالیزم چەندان پەیمانی ئابووریو سەربازیو سیاسی ئەسەپێنێت بەسەر ئەو وڵاتانەدا، کە ئەم پەیمانانەش ئەبنە هۆی لە دەستدانی سەربەخۆیی وڵاتەکان. هەروەها لە ڕێگەی ناردنی سەرمایە، بازرگانیی نا بەرامبەر، یاریکردن بە نرخ، قەرزو قۆڵە، بە چەندان شێوە بە ناوی یارمەتییەوە، پاڵەپەستۆ خستنە سەر وڵات لە لایەن ڕێکخراوە داراییە نێو نەتەوەییەکانەوە.. وڵاتان ئەچەوسێننەوە.

لەگەڵ بەکارهێنانی ئەم شێوازانەدا، دەوڵەتە گەورە ئیمپریالیستییەکان چەندان وڵاتی تریان بە تایبەتی لە ئاسیاو ئەفەریقاو ئەمریکای لاتیندا بە خۆوە بەستووەتەوە. ئەگەر چی لەو وڵاتانەدا حکومەتی ناوچەیی، لەشکر، دەوڵەتو ئەنجومەنی ناوخۆ هەیە لە واقیعدا شێوەیەك سەربەخۆیی سیاسیی ڕووکەش هەیە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بواری ئابووریو سیاسەتی ئیمپریالیستییانەدا جێگەی یەکەمی گرتووەتە دەست خۆی. ئیمپریالیزمی ئەمریکا ئەمرۆکە[1] بووەتە گەورەترین ئیستیعماری نێونەتەوەیی جیهان. سێ چارەکی هەموو قازانجی سەرمایەی دەزگا ئینحیسارییەکانی وڵاتە سەرمایەدارییەکان ئەچێتە گیرفانی کۆمپانیا ئەمریکاییەکانەوە.

ئیمپریالیستی ئەمریکا بووەتە میراتگری هەموو نەریتو دابو سیستمێکی ژێر دەستەکاریی ئیمپریالیستی جیهانو ئەمریکا بووەتە ژاندارمی نێونەتەوەیی هاوچەرخ، چونکە ئەرکی لێدانی هەموو جۆرە ڕاپەڕینێکی ئازادیخوازانەی بە ئەستۆی خۆی گرتووەو مەڵبەندی هەرە گەورەی ئیستیعماری تازەیە.

ئامانجو ئەرکی سەرەکیی سەرشانی هەموو هێزە نیشتمانیو پێشکەوتنخوازەکان دژی ئیمپریالیزمو ئیستیعماری تازە ئەوەیە ئەم خاڵانەی خوارەوە بە جێ بگەیەنێت:

*١–سڕینەوەی هەموو شوێنەوارێكو پاشماوەی ئیستیعمارو دژایەتیکردنی ئیستیعماری تازە، ڕیشەکەنکردنی هەموو دەسەڵاتێکی ئیمپریالیزم، دەرکردنی دەزگا ئینحیسارییەکانی دەرەوەو دانانی دەزگای سنعەتیی نیشتمانی.*

*٢–لەناوبردنی هەموو ڕژێمە سەر بە ئیمپریالیستییەکان، نەهێشتنی پاشماوەی فیوداڵی، جێبەجێکردنی بنچینەییانەی چارەسەرکردنی زەویوزار بە هاریکاریی هەموو جووتیارەکانو بە قازانجی جووتیارەکان بێت.*

*٣–دانانی سیاسەتێکی دەرەوەی ئاشتیخوازانەی دژی ئیمپریالیستی.*

*٤–بڵاوکردنەوەی دیموکراتییەت لە ژیانی کۆمەڵایەتیداو سەقامگیرکردنی مافو ئازادییە دیموکراتییەکان بەو جۆرەی کە چارەنووسی وڵات بە کۆمەڵانی خەڵك بسپێردرێت.*

---

١–سەردەمی نووسینی کتێبەکە ئەگرێتەوە–وەرگێڕ.

٥-دابینکردنی خۆشیو دادی کۆمەڵایەتی.

★هێزەکانی بەرهەمهێنان - Production Forces

بریتین لـە هۆیـەکانی کارکـردن مەسـەلەی کارکـردن، زانـیاریو تەکنـیك، کـە بە هۆی ئەمانەوە خێروبێری مادی دێتە بەرهەمو ئەو کەسانەی ئەم هۆیانە لەگەڵ تاقیکردنەوەی خۆیاندا بەکاردێنن ئەتوانن هەموو بەرهەمە پێویستییەکانی ژیان بەرهەمبهێنن.

لـە هـەموو قۆناغـەکانی گەشـەکردنی کۆمەڵگـەدا، کۆمـەڵانی خـەڵکی زەحمەتکێش هێزی هەرە بنچینەیی بەرهەمهێنانن. کۆمەڵانی خـەڵکی زەحمەتکێش ڕۆڵـێکی گـەورە لـە بـواری گەشـەکردنی ئابووریو بەرهەمهێناندا دیاریی ئەکەن. هێزە بەرهەمهێنەرەکان توخمە شۆڕشگێڕەکانی بەرهەمهێنانو گەشەکردنیان لەگەڵ گەشەکردنی باری کۆمەڵایەتیدا ئەڕوات.

هـێزە بەرهەمهێـنەرەکان خـاڵی پەیوەندیی نێوان ئادەمیزادو هێزە سروشتییەکانن، بە ڕادەی زاڵبوونی ئادەمیزاد بەسەر بوارەکانی سروشـتدا هـێزە بەرهەمهێـنەرەکان گەشـەئەکەن، واتـە هۆیـەکانی بەرهەمهێنانو دەستاوردەکانی کارکردن گەشەترو لایەنیانەتر ئەبن. ئاستی زانیاریی چالاکیو فەرهەنگیی مرۆڤ بەرزتر ئەبێتەوە.

لـە بـواری بەرهەمهێـناندا مرۆڤ گەورەترین هۆی بەرهەمهێنانە.. چەرخی نوێ دروست ئەکەن، سوود لە هەموو لایەنە سروشتییەکان وەرئەگرن، بەسـەر هـێزی سروشـتییەکاندا زاڵ ئـەبن، زانـیاریی تەکنـیکیو زانسـتیی خۆیـان زیاتر ئەکەن، بەمجۆرە پێداویستییەکانی گەشەکردنو بەرهەمهێنان دابین ئەکەن.

★هۆیەکانی بەرهەمهێنان - Production Means

بریتیـیە لـە پـەیوەندیی نـێوان خـەڵك لـە بـواری بەرهەمهێناندا، کە ئاڵوگۆڕو دابەشکردنی خێرو بێری مادی سەقامگیر ئەکات.. وە هـەروەها پایـەو ژێرخانی ئابووریی کۆمەڵ پێکدێنێت. ماهییەتی ئەم هۆیانەی بەرهەمهێنانە کە سەرتاپای سیستمی ژیانی کۆمەڵایەتیو دەروونـیی کۆمـەڵ دیـاری ئەکات.. گرنگترین مەسەلە لە بارەی هۆیەکانی بەرهەمهێنانەوە بریتییە لەوە کە ئایا هۆیەکانی بەرهەمهێنان بـە دەست کێوەیە؟ ئایا بە دەست هەموو کۆمەڵەوەیە یان بە دەست چەند کەسانێکەوەن؟ هەندێ کۆمەڵ یان چەند چینێکن کە سوود لـە خاوەندارێتـیی هۆیـەکانی بەرهەمهێنان وەر ئەگرنو لـەو ڕێگەیـەوە خـەڵکی ئەچەوسێننەوەو دەست بەسەر بەرهەمی ڕەنجیاندا ئەگرن. بـە واتایـەکی تر باری چۆنێتیی هۆیەکانی بەرهەمهێنان ئەوەمان نیشان ئەدات کە ئەو هۆیانە چۆن لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵدا دابەش ئەکرێن.

هۆیـەکانی بەرهەمهێنانو هـێزە بەرهەمهێـنەرەکان لـە یەکێتییەکی دیالەکتیکییانەدا یەك ئەگرنەوە، پلەی گەشەکردووی هۆیەکانی بەرهەمهێنان ئاستی گەشەکردووی هێزە بەرهەمهێنەرەکان دیاریی ئەکات. هەروەها هۆیەکانی بەرهەمهێنان کارێکی کاریگەرانە ئەکەنە سەر پێگەیشتنو گەشەکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان..

یاسـای گشـتیی ئـابووری لـە هـەموو ڕواڵەتـێکی کۆمەڵایەتـیانەو بـاری ئـابووریدا بریتـیـە لە یاسای پێکەوە گەشەکردنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان لەگـەڵ خەصڵەتی هـێزە بەرهەمهێـنەرەکاندا. هـێزە بەرهەمهێـنەرەکان تەنـیا لە کاتێکدا ئەتوانن بە شێوەی گشتیو بێ بەرهەڵستکاری گەشـە بکـەن کـە هۆیـەکانی بەرهەمهێـنان لـە کۆمـەڵدا لەگـەڵ خەصڵەتو باری هێزە بەرهەمهێنەرەکاندا لە قۆناغێکی دیاردا بە یەکسانی گەشە بکەن.

★هیومینیسم - Humanisme

١-نـاوی جـۆرە فەرهـەنگو کولـتوورێکە کـە بریتی بێت لەئەدەبی کلاسیکی، کە دیسان ئەگونجێت پێی بوترێت "مرۆڤ شوناسی". ئەمەش بریتییە لە لێکۆڵینەوەو فیزیۆلۆجیو زانستی پزیشکیو ڕەوانشوناسیو ڕەوشتو کۆمەڵ شوناسیو ئەنترۆپۆلۆجی.

٢-یان بە فەلسەفەی "شیللر[1]" ئەوترێت کە جۆرێکە لە فەلسەفەی سوبجلتنیڤیزم.

★یونیسێف - Uniscef - UNICEF

کورتکراوەی ئەم ناونیشانەیە:

United Nations International Children`s Fmergency Fund “UNICEF”

سندووقێکی دارایـی نـێودەوڵەتانی سـەر بـە نەتـەوە یەکگرتووەکانە بـۆ کاروبـارو پێویسـتیی مـنداڵان خەرج ئەکرێت.. ناونیشانی کورتکـراوەی "یونیسـێف" لـە ١١ی مـانگی کـانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٩٤٦ دا لـە لایـەن کۆمـەڵی گشـتیی نەتـەوە یەکگـرتووەکانەوە دامـەزراوە. ئـەم ڕێکخـراوە بـە پـێی فـەرمانو ئامۆژگارییـەکانی ئەنجومـەنی کۆمەڵایەتیو ئابووریی نەتەوە یەکگرتووەکان کار ئەکات. ئـەرکی سەرشـانی ئـەم ڕێکخـراوە چاودێریکردنی تەندروستیی منداڵانو جێبەجێکردنی بەرنامەی خۆشگوزەرانیی منداڵانە لەو وڵاتانەدا کـە بـە هـۆی کارەسـاتی دووەمـین جـەنگی جیهانییـەوە زیانـیان لێکەوتووە. لە دواییدا سەرپەرشتیی منداڵانی وڵاتە دواکەوتووەکانی خستە ژێر چاودێریی خۆیەوە.

---

١-F.C.S: Schiller

ئـەم سندووقە لـە شاری "نیویۆرک"ە، لە لایەن ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوەو خەڵکە خێر خوازەکانەوە باربوو[1] ئەکرێت. یەکێك لـە ئەرکە هەرە دیارەکانی ئەم سندووقە دابینکردنی شیرە بۆ ئەو دایکانەی توانای بەخێوکردنی منداڵەکانیان نییە کە بە شیری خۆی بەخێویان بکات.

**★یونیسکۆ - UNESCO**

ئەم وشەیە کورتکراوەی ئەم ناونیشانەیە:

United Nations Educational Scientifie and Cultural Organization "UNESCO"

ڕێکخراوی زانستیو فەرهەنگیو پەروەردەکاریی نەتەوە یەکگرتووەکانە، ناونیشانی کورتکراوەی "یونیسکۆ" لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٦دا دانراوە، ئامانجی ئەم ڕێکخراوە بە پێی پەیڕەوی ناوخۆی ڕێکخراوەکە ئەوەیە پشتگیریی ئاشتیو ئاسایشو هاریکاریی نێوان نەتەوەکانی جیهان بکات لە ڕێگەی پەروەردە کردنو زانیاریو فەرهەنگییەوە. لە پێناوی ڕێزگرتنی دادو دەوڵەتو یاساو مافی ئادەمیزادو ئازادیی گشتیو تاکەکەسی، بە پێی نووسراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان..

**سێ پایەی ئەم ڕێکخراوە بریتین لە:**

**کۆنفرانسی گشتی:**

هەر دەوڵەتێکی ئەندام لەو ڕێکخراوەدا نوێنەری تایبەتیی خۆی هەیە تیایداو هەر دوو ساڵ جارێك بۆ دەنگدانی دانانی بەرنامەو بودجەی ساڵانەی ڕێکخراوەکە کۆ ئەبنەوە.

**دەزگای بەڕێوەبردن:**

لە ٢٤ ئەندامی ڕێکخراوەکە پێکهاتووە، بەلای کەمەوە هەر ساڵی دوو جار کۆ ئەبنەوەو لێپرسراون بەرامبەر جێبەجێکردنی بەرنامەی هەڵبژێردراوی ڕێکخراوەکە.

**سکرتارییەت:**

سکرتێری گشتیی لێپرسراوێتیو مەڵبەندەکەشی لە پاریسە.. یونیسکۆ یەکێکە لە ڕێکخراوە تایبەتیو دیارەکانی ڕێکخراوی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان.

چالاکییەکانی یونیسکۆ لە زەمینەی ئەم هەشت خاڵەی لای خوارەوەدا ئەکرێت:

**١-فێرکردن و پەروەردەکردن:**

لەناوبردنی نەخوێندەواریو فێرکردنو پەروەردەی بنچینەیی، فراوانکردنی ئاستی زانیاریو پەروەردەکردن، ڕێزگرتنی مافی مرۆڤ لە ڕێگەی فێرکردنو پەروەردەکردنەوە، دەسخستنی زانیاری لە بارەی هونەرو فێرکردنو پەروەردەکردنەوە.

**٢-زانستی سروشتی:**

هاریکاریکردنی زۆرتر لە نێوان زانایانو هاندانی بەگشتیکردنی زانین.

**٣-زانستی کۆمەلایەتی:**

هاندانی خۆ ڕۆشنبیرکردنو زیاتر لە یەکتر گەیشتن لە نێوان ڕەگەزە جیاجیاکانو نەهێشتنی ناکۆکییە ئایینیو مەزهەبییەکان.

**٤-چالاکیی فەرهەنگی:**

فراوانبوونی ئاستی فەرهەنگی لە نێوان دەوڵەتەکانی ئەندامو بە دەستهێنانی هەموو جۆرە بەرهەمێکی هونەریو ئەدەبیو فەلسەفییانە.

**٥-هاتوچۆکردن:**

زانیاریی لە بارەی توانای کارو خوێندنەوە لە دەرەوە وڵاتو گەشتو گوزاری دۆستانە.

**٦-پەیوەندیی خەڵکی:**

ئاگادار بوونی هەموو لە کاروبارەکانی یونیسکۆ، تێگەیشتن لە ڕووداوە گرنگەکان لە بواری پەروەردەو فێرکردنەوە. زانینو فەرهەنگ، یارمەتیدانی خەڵك بۆ ئاسانکردنی فێربوونی زانین.

**٧-نەخشە دانان:**

ئامادەکردنی پارەو پێداویستی بۆ قوتابخانە، کتێبخانە، دەزگاو دامەزراوە زانیارییەکانی ئەو سەر زەمینەی لە شەڕدا وێران کراونو گەشەیان نەکردووە.

**٨-یارمەتیی هونەری:**

پەیداکردنی کارزان لە بواری فێرکردنو پەروەردە کردندا، فێرکردنی مامۆستا، فێرکردنو پەروەردە کردنی گشتی، لێکۆڵینەوەی زانستییانە، ڕاوێژکردنی زانستیی دەوڵەتەکانی ئەندام لە بواری نەهێشتنی نەخوێندەواریو دانانی قوتابخانەو پێگەیاندنی مامۆستاو زۆربوونی ئەندازیاریی کارەباییو ئەمجۆرە شتانە.

---

١-باربوو-یارمەتیی داراییە-وەرگێڕ.

## کورتەی هەندێك زاراوەو وشەی فەلسەفیو سیاسی بەسەر یەكدا:

★ئابسۆلوتیزم - Absolutisme

ئابسۆلۆ مانای "تەواو" ئەگرێتەوە، مەبەست لە حكومەتێكی تەواو لە تەواوو سەرۆكایەتیی یەك كەسە بەسەر كۆمەڵدا، لەو حاڵەتەدا دەسەڵاتی سەرۆكی حكومەت بێ سنوور ئەبێت.

★ئەپیسكۆپالیزم - Episcopalisme

ناوی مەسلەكێكە كە لە سەدەی شازدەیەمدا لە ئەوروپا پەیدابووە، ئەم مەسلەكەش سەر بە "جان گالۆن" ثیولۆجیستی فەرەنسییە، ئەو پشتی بە سەڵتەنەت نە ئەبەست، لەو باوەڕەدا بوو كە دەسەڵاتی دەروونی زاڵە بەسەر دەسەڵاتی گیانیدا.

★ئۆپتیمیسم - Optimisme

بڕواكردنە بەخۆشبینیو نیازی چاكە، ئەم زاراوەیە بە زۆری بەشێكە لەو زاراوانەی كە پەیوەندییان بە نیازی سیاسییەوە هەیە.

★ئۆپۆرتونیسم - Opportunisme

ئەو كەسانەن كە زۆر بە گورجی بە پێی گۆڕینی باری سیاسی یان گۆڕینی ڕژێم یان سەركردەكان ئەوانیش لە پێناوی قازانجی خۆیاندا بیروڕای خۆیان بەو بارەدا ئەگۆڕن.

★ئەپۆلۆجیسم - Apologisme

ناوی كۆمەڵێك بوو بەناوی "ئاپۆلۆجیستەكان" كە لە سەدەی حەڤدەیەمدا لە ماوەی شەڕە ناوخۆییەكانی بەریتانیا لە پێناوی مافی خەڵكدا بەرەنگاری پادشا ئەوەستان. ئەو فەیلەسووفانەش لە سەرەتای پەیدابوونی مەسیحدا بەرەنگاری بیروباوەڕی مەسیحیان ئەكرد، بەوانیش هەر ئەوترا "ئاپۆلۆجیست".

★ئاتاشە - Attache

پیاوی باڵیۆزخانەكان.

★ئوتۆریتاریانیسم - Autoritarianisme

سیستمێكی حكومەتییە كە ئازادیی تاكە كەسی تیادا ئەكەوێتە ژێر تیشكی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە.

★ئۆتۆكراسی - Autocracy

بە سیستمێكی حكومەتی ئەڵێن كە تەواوی دەسەڵات بە دەست سەركردەكانی دەوڵەتەوەیە.

★ئاریستۆكراسی - Aristocrascy

دەوڵەتی پیاو ماقووڵان، سیستمو جۆرە حكومەتێكە كە دەسەڵاتی دەوڵەت بە دەست ژمارەیەكی كەم لە پیاو ماقووڵەكانەوە بێت.

★ئاریستۆكرات - Aristocrate

ئەندامی دەزگای دەسەڵاتدارێتیی پیاو ماقووڵان، كە لایەنگری دەوڵەتی پیاو ماقووڵان بێت.

★ئەسكولاستیك - Schoolastic

پەندو فەلسەفەی فەیلەسووفەكانی سەدەی ناوەڕاست كە لە قوتابخانەكاندا "وانە" یان ئەوتەوە، ئەمانە پێیان ئەوتن "ئەسكۆلاستیك".. فەلسەفەی ئەو زانایانە -كە پێیان ئەوتن مامۆستایانی خاوەن قوتابخانە- بە زۆری ئاینییانە بوون.. ئابلار، تامسداكن، گیوم داكن، سنت ئانسلم، .. ئەمانە لەو جۆرە مامۆستایانە بوون.

★ئەسكیپیسم - Escapisme

بە مانا ڕاكردن ئەگرێتەوە، مەبەست ڕاكردنە لە بەشداریكردنی كاری كۆمەڵایەتیانە، قبووڵ نەكردنی فەرمانی دەوڵەتو بەشداری نەكردن لە كاروباری دەوڵەتیدا.

★ئیكسپانسیونیست - Expansioniste

لایەنگرانی داگیركردنی خاكی وڵاتان بە هۆی لەشكرەوە یان لە ڕێگەی ئابوورییەوە.

*ئالیگارشی – Olygarichie

ڕەوشتی جۆرە حكومەتێكە كە لە لایەن چەند كەسێكەوە بەڕێوە ببرێتو هەموو دەسەڵاتی دەوڵەت بە دەست كۆمەڵێكی دیاریكراوەوە بێت.

★ئیمپریال- Imperial

ئیمپراتۆری یان شاهەنشاهی ئەگرێتەوە.

★ئیمپریالیست - Imperialiste

بە لایەنگرو ئیمپراتۆریخواز ئەڵێن.

★ئیمپریالیزم - Imperialisme

ئیمپراتۆریخواز، بە بیرو باوەڕو ڕەوشتێك ئەڵێن کە ئامانجی هێنانەدیی ئیمپراتۆری‌و فراوانکردنی قەڵەمڕەوو حوکمکردن بێت بەسەر کەسانی تردا.

★ئەگوییسم - Agoisme

لەو باوەڕەدایە کە ئادەمیزاد لە هەموو کات‌و شوێنێکدا خۆ پەرستە.

★ئانارشی - Anarechie

ئاژاوە، نارێك‌و پێکی‌و هەراو زەنا، لە زەمانی یۆنانیدا بە مانای "بێ حکومەتی" هاتووە.

★ئانارشیست - Anarechiste

ئاژاوەچی.

★ئانارشیسم - Anarechisme

ئاژاوەچی، ئانارشیزم دەوڵەت دووچاری مەینەتیی کۆمەڵایەتی ئەکات.

★ئەنتەرناسیۆنال - International

جیهانی، نێونەتەوەیی.

★ئەنتەر ناسیونالیسم - Internationalisme

بەرامبەر بە ناسۆنالیزمە، بەو بیروباوەڕە ئەڵێن کە لەو باوەڕەدایە هاریکاری‌و یارمەتیی نێوان نەتەوەکانی جیهان مایەی خۆشبەختی‌و هەمیشە بە ئاشتی پێکەوە ژیان‌و ئارامیی نەتەوەو دەوڵەتەکانی جیهانە.

★ئەنتلکتوال - Intellsctual

ڕۆشنبیر، پیاوی ئازاو جوامێر..

★ئەنتلکتوالیسم - Intellectualisme

ڕەسەنایەتیی هۆش‌و بیر، بەوەی ئەڵێن کە لەو باوەڕەدایە زانست لە ئەقڵەوە هاتووە، ئەقڵ سەرچاوەی زانین‌و دۆزینەوەی ڕاستییە، یان زانستی ڕاست تەنیا لە ڕێگەی ئەقڵ‌و هۆشەوە ئەبێت.

★ئەندوستریالیسم - Industerialisme

سنعەتیکردنی ژیانی ئادەمیزاد، بایەخدان بە سنعەت‌و کارخانەو چەرخ‌و ئەهمییەتدان بە تەکنیك.

★ئەندیڤیدوالیسم - Individualisme

باوەڕکردن بە ڕەسەنایەتیی تاکە کەس، بە پێی ئەم فەلسەفەیە پێویستە ڕێگەی هەموو کەسێك بدرێت بە ئارەزووی خۆی بیربکاتەوەو کار بکات.

★ئۆبجێکتیڤیسم - Opjectivisme

کە پێی ئەڵێن ئایدیالیزم.

★ئۆبجێکتیف - Objective

فەلسەفەیەکە ڕاستی ئەداتە بەر سەرنجی هەستپێکردن..

★ئوتارکی - Autarky

واتا سەربەخۆیی ئابووری.

★ئوڵترا-ئەندیڤیدوالیسم - Ultra - Individualisme

باوەڕکردنی زیاد لە ڕادە بە تاکە کەس.

★ئولتیماتۆم - Ultimatum

دوا پێشنیارێکە کە دەوڵەت ئەیدات بە دەوڵەتێکی تر، ئەگەر هاتوو ئەو پێشنیارە وەر نەگیرا ئەوا ئەبێتە شەڕ لە نێوانیاندا.

★ئیرۆلاسیۆنیسم - Irolationisme

باوەڕبوون بە گرتنی یەك ڕێبازو سیاسەت‌و گۆشەگیریی ئاشکرای نەتەوەیەك لە هاریکاریی سیاسی‌و ئابووریدا.

★باکونینیسم - Bakuninisme

بیوباوەڕی سیاسیی باکونین، پێشەواو ڕابەری ئانارشیستەکان.. ئەو ئەم بیروڕایەی دامەزراند کە تێکدانی دەوڵەت‌و پاراستنی مافی تاکە کەسی کارێکی خواوەندانەیە.

★بەربەریسم - Barbarisme

دڕندەیەتی، حاڵەتی ژیانی سەرەتایی، کۆمەڵگای سەرەتایی‌و ئەو هۆزو تیرو خێڵانەی دوورن لە شارستانێتییەوە.

★بلۆك - Bloc

دەستەیەکی یەکگرتوو، کۆمەڵێکی پێکەوە بەستراو..

★بۆرجوا - Bourgeois

سەرمایەدار، دەوڵەمەند، شارنشین، خاوەن سامان.

★بۆرجوازی - Bourgeoisie

سەرمایەداری، چینی دەوڵەمەندی مامەڵەچی.

★بنتهامیسم - Benthamisme

جۆرێکە لە جۆرەکانی لیبرالیزم.

★پاتریۆت - Patriot

نیشتمانپەروەر.

★پاتریۆتیسم – Patriatisme

نیشتمان پەروەرێتییە.

★پارتیکۆلاریسم - Particularisme

پەیوەندیی توندو تۆڵانەی هەر شارێك بە پاراستنی حاڵەتی تایبەتیی خۆیەوە.

★پلیتیک - Politique

زانستی سیاسەت، یان سیاسەت.

★پارتیزان - Partisan

چەتەی چەکدار، لایەنگر، سەربازی چیا..

★پەرلەمان - Parlemant

ئەنجومەنی نوێنەران، ئەنجومەنی شووراو سەنا.

★پەرلەمانتار - Parlementaire

ئەندامی پەرلەمان، دەقاودەق لەگەڵ نەرێتو یاساکانی پەرلەماندا.

★پەرلەمانتاریسم - Parlementairisme

جۆرە ڕەوشتێکی حکومەتە، کە هێزە چەکدارەکان بەرپرسیاری کاروباری پەرلەمان ئەبن.

★پاروشیالیسم - Parochialisme

سنووردارکردنی فیکریو دڵ بەستن بە ئەنجامی کاری کۆمەڵیو ناوچەیی.

★پاسیفیسم - Pacifisme

ئاشتیخواز، هەڵوێستی دژی جەنگ بە هەر جۆرو شێوەیەك بێت.

★پراگماتیسم - Pragmatisme

کرداری ڕەسەنانەو نوختەیەك بەرامبەر بە میتافیزیك، پێشەوای ئەم بیروڕایە "ویلیام جیمز"ی ئەمریکایی بوو.

★پروڤینسلیسم - Provinclisme

باوەڕبوون بە نەبوونی ناوەندێتیی کاروباری کیشوەر لە پایتەختداو دابەشکردنی ئەرکەکانی هەر ناوچەیەك بە لێپرسراوی خۆی.

★پلوتوکراسی - Ploutocracy

ناوی سیستمێکی حکومەتییە کە لە لایەن دەوڵەمەندترین کەسی وڵاتەکەوە بەڕێوە بچێت.

★پلورالیسم - Pluralisme

بە فەلسەفەی سیاسی ئەوترێت کە نابێت پەیوەندیی تاکە کەس ببەسترێت بە سیاسەتی دەوڵەتەوە، بەڵکو پەیوەندیی تریش هەیە وەکو پەیوەندیی مەزهەبیو ئاینی.

★تائویسم - Taoisme

ناوی بیروباوەڕێکی سیاسییانەیە کە لائاوتە لە ساڵی (٦٠٤–٥٠١)ی پێش زاینی داینـاوە، فەلسەفەکەی جۆرە مەزهەبێکی لیبرالییانەیە.

★تاکتیک - Tactic

هونەری جەنگ، ڕێ نیشاندانی لەشکر لە شەڕکردن لەگەڵ دوژمندا.

★تامیسم - Thomisme

مەکتەبی سیاسیی "تامس داکوین" لە ساڵانی (١٢٢٥–١٢٧٤)ی پێش زانینیدا.

Theocracy - ìÓÇÑßæíË★

بە ڕژێمو ڕەوشتی جۆرە حکومەتێك ئەڵێن کە پیاوە ئاینییەکان ببەن بەڕێوە، بە واتایەکی تر حکومەتی مەزهەبییانەیە.

★ترادیسیۆن - Tradition

نەریتی کۆمەڵایەتی، عورفو عادەت..

★ترادیسۆنالیسم - Traditionalisme

باوەڕ بە ڕەسەنییەت، نەریت پەرستی..

★ترۆتسکیسم - Trotskisme

دەستەیەکی لادەر بوون لەناو ڕاپەڕینی ڕووسیادا کە ترۆتسکی یەکێك لە پێشەواکانی ئەو ڕاپەڕینە بوو.

★تیرۆر - Terreur

دڕەندەیی و کوشتن و لەناوبردنی سەرپێچی کاران.

★تیرۆریسم - Terreurisme

بیروباوەڕی پیاوکوژانە.

★تریدیۆنیۆن - Trade - Union

ناوی ڕێکخراوێکی کرێکارانە کە لە پێناوی باشبوونی باری ژیانی کرێکاراندا تێ ئەکۆشێت، وەکو زیادکردنی کرێی ڕۆژانەی کرێکاران و کەمکردنەوەی سەعاتی کارکردن، دابینکردنی پێداویستیی ژیان.

★تریدیۆنیۆنیسم - Trade - Unionisme

یەکێتییەکی کرێکارانەیە، جیاوازیی لە نێوان تریدیۆنیۆنیزم و سۆشیالیزم هەیە، کرێکاران لە سەرەتاوە ئەبنە تریدیۆنیۆنیزم.

★توتالیتاریونیسم-Totalitarianisme

بە مانا حکومەتی کۆمەڵییە کە دەستکاریی هەموو کاروبارێکی ژیانی تاکە کەسی بکات و ڕێکی بخات.

★تیرانی - Tyrannie

بە دەوڵەتێکی ستەمکارو زۆردار ئەڵێن.

★تیرانیسید - Tyrannicide

بە مانا زۆردار کوژییەو باوەڕی بە کوشتنی نهێنییانەو تیرۆری لێپرسراوانی دەوڵەتە.

★تیمۆکراسی - Timocracy

بە حکومەتێك ئەوترێت کە لێپرسراوانی ئەو دەوڵەتە تەنیا لە پێناوی ڕێزو شانازیدا کاربکەن، ئەم وشەیە ئەفلاتوون لە کتێبەکەی خۆیدا کە ناوی "جمهورییەت" بوو بەکاری هێناوە.

★دیپارتمانتالیسم - Departmentalisme

ئەو جۆرە حکومەتانەیە کە سەربەخۆیی بە ناوچەو پارێزگاکانی خۆی بدات.

★دیسانترالیسم - Decentralisme

بریتییە لە گواستنەوەی چاودێری و کۆنترۆڵ لە دەسەڵاتی ناوەندییەوە بۆ سەر دەزگا ناوچەییەکان.

★دیسپۆت - Despot

بە مانا زۆردار ئەگرێتەوە.

★دیسپۆتیسم - Despotisme

بەو دەوڵەتە ئەڵێن کە لە لایەن کەسانی زۆردارەوە بەڕێوە ببرێت.

★دیماگۆجی - Demagogio

خەڵك خەڵەتاندن، سادە فریودان.

★دیموکرات-Democrate

ئازادیخواز، لایەنگری ئازادی.

★دیموکراتیک - Democratique

شێوەی یەکسانی.

★دیموکراسی - Democracy

ئازادیخوازی یان ڕەوشتێك لە سیاسەت و حکومەتدا کە دەسەڵات بە دەست خەڵك و نوێنەرانی خەڵکەوە بێت.

★دیمونستراسیۆن - Demonstration

خۆ نیشاندانی دەستە کۆمەڵی کە چەند تیپ و گرۆیەك بەشداریی تیادا بکەن و بە هۆی قسەکردنەوە بۆ خەڵك لە پێناوی داخوازییەکانیاندا تێ بکۆشن.

★دۆگماتیسم-Dogmatisme

شوێنکەوتنی کوێرانە بە بێ پرسیارکردن پەیڕەویی ڕێبازێك بکات.

★دیالەکتیک-Dialectique

قسەکردن، گفتوگۆکردن بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستێك بە ڕێگەیەکی ئاقڵانەو مەنطقیانە کە پێی ئەڵێن "ماتەریالیزمی دیالەکتیك".

★دیپلۆمات - Diplomate
سیاسی، سیاسەتزان.
★دیپلۆماسی - Diplomacy
سیاسەت، زانستی سیاسەت، پەیماندارێکی نێوان وڵاتانو کیشوەرەکانی دەرەوە.
★دیکتاتۆر - Dictateur
زۆردار، تاکە ڕەئی، ڕەئی خۆ فەرزکەر..
★رادیکالیسم - Radicalisme
بیرو باوەڕێکی سیاسییانەیە کە لایەنگرانی ئەو بیروباوەڕە باری ڕۆژگاریان بەدڵ نییەو داوای وەزعێکی تازەو تێکشکاندنی هەموو یاساو ڕژێمەکان ئەکەن، داوای دامەزراندنی دەزگای سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریی تازە ئەکەن.
★ڕاسیۆنالیسم - Rationalisme
فەلسەفەی ڕەسەنێتیی ئەقڵ، باوەڕبوون بە پێشکەوتنو سەرکەوتنی ئەقڵ بەسەر هەموو شتێکدا.
★ریستوراسیۆن - Restauration
ڕۆژگاری گەڕانەوەی سەڵتەنەتی بوربون کە لە ساڵی (١٨١٤) تا (١٨٣٠)ی خایاند.
★ریفراندۆم - Referendum
پرسو ڕا کردن بە بیروڕای گشتی لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ ئەوەی زۆربەی بیروڕای خەڵك وەربگرێت.
★ڕیفۆرم - Reforme
چارەسەرکردنو گۆڕینی ڕووکەش لە کاروباری ئابووریی سیاسیدا بێ ئەوەی پەنا ببرێتە بەر شۆڕشو یاخی بوون.
★ریفۆرماسیۆن - Reformation
زاراوەی سیاسیو ئابووری، ڕاپەڕینی چارەسەرییانە.
★ریڤۆلیوسیون - Revolution
شۆڕش، ڕاپەڕینو پەلاماردان.
★رۆیاڵیسم - Royalisme
سەڵتەنەتخوازی، شێوەیەکی سەڵتەنەتخوازی لە بەرامبەر کۆماریخوازان.
★ریتوالیسم - Ritualisme
نەریت پەرستی، باوەڕبوون بە نەریتە مەزهەبییەکان.
★ریڤیژیۆنیسم - Revsionisme
بە بیرو باوەڕی ئەدوارد برنشتاین سیاسەتزانو نووسەری سۆشیاڵ دیموکراتەکانی ئەڵەمان ئەڵێن.
★ژیۆپۆلتیک - Geopoltiqoue
ناوی زانستییەکی تازەیە کە ئامانجی لێکۆڵینەوەیە لەسەر پەیوەندیی نێوان جوگرافیاو ژیانی دەسەڵاتدارو ئیمپراتۆرییە گەورەکان.
★ساتیاگراها - Satyagraha
دەستکەوتی ڕاستی، ئەو ڕاپەڕینە سیاسیو مەزهەبیانەیە کە لە ساڵی (١٩١٩)دا دەستیپێکرد لە رووی دەست درێژکارانی بێگانە.
★سانترالیسم - Centralisme
شێوازی ناوەندێتی لە ڕەوشتی بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا، ناوەندێتیی کاروباری دەوڵەت.
★سزاریسم - Czarisme
حکومەتی قەیسەر، هەر بە هەمان مەفهوومی زۆردارو ئۆتۆکراسو دەسەڵاتی ئیمپراتۆر هاتووە.
★سکولاریسم - Secularisme
دنیا پەرستی، باوەڕ بە کاروباری دنیاییو خۆشەویستیی دنیاو باوەڕ نەکردن بە دەرەوەی ئەمانە.
★سینات - Senat
ئەنجومەنی پیاوماقووڵان، پیاوە گەورەکان، پیاوە دەوڵەمەندەکان، ئەنجومەنێك کە لە لایەن خەڵکە دەرکەوتووەکانەوە –واتا دەوڵەمەندەکانەوە– هەڵبژێردرابێت.
★سیناتۆر - Senateu r
نوێنەری ئەنجومەنی پیاوە گەورەکان، ئەنجومەنێك کە لە لایەن خەڵکە دەرکەوتووەکانەوە هەڵبژێردرابێت.
★سەندیکا - Syndicat
یەکێتیی کرێکاران، نەقابەی کرێکاران، ڕێکخراوەی کرێکاران.
★سەندیکالیسم - Syndicalisme
ڕێبازێکی سیاسیانەو ڕاپەڕینێکی شۆڕشگێڕانەیە، ئامانجی ئەوەیە بەهۆی ڕێکخراوە کرێکارییە کانەوە دەوڵەتی دیموکراتیو پەرلەمانی دابمەزرێت.

★**سۆشیالیست - Socialiste**

لایەنگری بیروباوەڕی سۆشیالیزم.

★**سۆشیالیسم - Socialisme**

ڕێبازێکە ئامانجی دامەزراندنی کۆمەڵگەی دەستەکۆمەڵییە بە قازانجی خەڵك، بە هۆی موڵکدارێتیی دەوڵەتەوە هەموو هۆیەکانی بەرهەمهێنان بە دەست دەوڵەتەوە بێتو دەوڵەت سەرپەرشتییان بکات.

★**شۆڤێنیسم - Chauvnisme**

یاریکردن بە نەتەوە، یاریکردن بە نیشتمان، زیادە ڕەوی، درۆو دەلەسەی کوێرانە لە بواری نیشتمانپەروەرێتیدا.

★**فابیانیسم - Fabianisme**

ڕێبازی سیاسیی ڕێکخراوێکی سۆشیالیستییانەیە لە بەریتانیا، ئەوانە هەوڵیاندا سۆشیالیزم لەناو چینی ناوەڕاستدا دابمەزرێنن.

★**فاشیست - Fachiste**

ئەم زاراوەیە لە وشەی "فاشیسمۆ" کە ناونیشانی دروشمی دەسەلآت بوو لە ڕۆمی کۆن، وەرگیراوە.. بە مانا ئاژاوەچی ئەگرێتەوە.

★**فیودال- Feodal**

بەو کەسانە ئەڵێن کە زەویوزاریان زۆر بێتو فەرمان بەسەر جووتیارە ژێردەستەکانیاندا بکەن، واتە دەرەبەگ.

★**فیودالیتە - Feodalite**

شانشینی بچووك "طوائف الملوك" جۆرە حکومەتێکی بچووکە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبوون، خاوەن موڵکە بە دەستەلآتەکان هەر یەکەیان لە قەڵەمڕەویی خۆیاندا حوکمیان ئەکرد. ئەمانە هەمیشە بە جەنگی ناوخۆی یەکترەوە خەریکبوون، هیچ ئامانجێکی سیاسییان نەبووە.

★**فیودالیسم - Feodalisme**

جۆرە حکومەتێکی بچووکن لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبوون..

★**فاکسیۆن - Faction**

بە مانا ڕێکخراو ئەگرێتەوە، یان حزب..

★**فاکسیۆنالیسم - Factionalisme**

بە مانا حزب یان ڕێکخراو پەرستییە "جۆرج واشنتۆن" گەلێك بایەخی بەم ڕێبازە دابوو.

★**فاناتیسم - Fanantisme**

فاناتیزم یان فاناتیکیزم Fananticisme بە مانای بیرو باوەڕی کوێرانەو توندڕەوی لە هەر ڕوویەکەوە بێت، سیاسی بێت یان مەزهەبی یان ڕەوشتی.

★**فیدرال - Federal**

هاریکارێتی، یەکێتیی کار.

★**فیدراسیۆن - Federation**

یەکێتیو هاریکاریی نێوان چەند دەوڵەتێکی سەر بەخۆ کە وەکو دەوڵەتێکی یەکگرتوویان لێ بێت یان . یەکێتیی نێوان چەند دەستەو کۆمەڵە خەڵکێك.

★**فیدرالیسم - Federalisme**

جۆرە حکومەتو سیاسەتێکە کە بە پێی ئەو ڕێبازە پێویستە وڵات لە یەکێتیی چەند وڵاتێکی سەر بەخۆ پێك بێت.

★**فراکسیۆن - Fraction**

دەستەیەك هاو بیرو باوەڕ لەناو ڕێکخراوێك یان کۆمەڵێکدا.

★**فراماکۆنری - Framaconnerie**

کۆمەڵێکی نهێنییە لە هەندێك وڵاتانی ئەورووپادا هەیە.

★**فیزیۆکراسی - Physiocratie**

ڕێبازێکە، بە پێی ئەو ڕێبازە ئەبێت هێزی دەسەلآتدار دەستکاریی دانانی یاسا ئابوورییەکان نەکات.

★**کاپیتال- Capital**

سەرمایە..

★**کاپیتالیسم - Capitalisme**

واتە سەرمایەداریو بریتییە لە سیستمێك کە هەموو هۆیەکانی بەرهەمهێنان بە هۆی سەرمایەی تایبەتییەوە پێکبێتو ئەبنە موڵکی خاوەن سەرمایەکان.

★**کاپیتۆلاسیۆن - Capitulation**

دەسەلآتی کونسوڵی وڵاتێکی دەرەوەیە لەناو خۆی وڵاتێکدا بێت.

**کاتاکلیسم - Catacly isme**

واتا لافاوی جیهانی، ژێرەوژوور بوونی وەزعێك کە سەر تاپای جیهان بگرێتەوە.

**★کالڤینیسم** - Calvinisme

ناوی ڕێبازێکی سیاسیو مەزهەبییە کە لە لایەن "کالڤین"ی تیۆلۆجیستی فەرەنساییەوە دانراوە، ئەم ڕێبازە ڕێبازێکی ئازادیخوازانەو دیموکراتیانەیە.

**★کۆسمۆپۆلیتانیسم** - Cosmopolitanisme

ڕێبازێکی ژیانە کە ڕێزی هەموو بیرو هەستو داخوازیو بیرو باوەڕێکی گەلان ئەگرێتو هەوڵ ئەدات بە باشی لێیان تێ بگات.

**★کرافت یونیۆنیسم** - Craft - Unionisme

جۆرە ڕێکخراوێکی کرێکارانەیە کە جۆرە کرێکارێکی تیادایە لە ئیشو کاری تایبەتدا کار ئەکەن.

**★کۆمیتە** - Comite

ئەنجومەن، ئەو شوێنەی کە ئەندامە بەرزەکانی هەر ڕێکخراوێك یان کۆمەڵێك بۆ گفتوگۆ کردن تیایدا کۆ ئەبنەوە.

**★کۆمینفۆرم** - Cominforme

ڕێکخراوی پەیوەندیی ڕێکخراوە کرێکارییەکانە.

**★کۆنترا سۆشیال**- Contratsocial

یاسایەکە، کە سەرکردەکانی دەوڵەت بە پێی ئەو یاسایە مافی خەڵك بپارێزن.

**★کۆنترۆرسیسم** - Controrsisme

ناونیشانی کۆمەڵێکە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە بارەی پەیوەندیی نێوان دەوڵەتو کلیساوە گفتوگۆیان لەناو یەکدا ئەکرد.

**★کۆنستتیوشنالیسم** - Constitutionalisme

مەشروطیەت، حکومەتی مەشروطە "مەرجدار" بە پێی یاسایەك بە ناوی یاسای بنچینەییەوە حوکمی خەڵك بکات.

**★کۆنسرواتیسم** - Conservatisme

پارێزگاری لە بواری مەزهەبیو سیاسیو کۆمەڵایەتییەوە.

**★کۆنسرواتیرف** - Conservatirph

ڕێکخراوی کۆنە پارێز، ڕەوشتی کۆنە پارێزیانە.

**★کونسول** - Consul

کار بەدەستی دەوڵەتی، لە وڵاتێکی بێگانەدا بۆ لێکۆڵینەوەو پەیوەندیکردن لە بارەی کاروباری هاوڵاتییەکانییەوە.

**★کونسولات** - Consulat

کونسولگەری، پلەو پایەی کونسول.

**★کۆنفیدراسیۆن** - Confederation

یەکێتیی نێوان چەند وڵاتێك کە هەموویان وەکو دەوڵەتێکی یەکگرتوو پێکهاتبن، بەڵام لەناو ئەو دەوڵەتەدا هەر دەوڵەتێك سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت.

**★کونڤانسیۆن** - Convention

بڕیارنامەی نێوان چەند وڵاتێك لە بارەی بازرگانییەوە، ناوی ئەنجومەنێکی نائاساییە کە دەسەڵاتی تەواوی پێدرابێت "لە بارەی دەسکاریکردنی یاسای بنچینەییەوە".

**★کواتیسم** - Quatisme

خۆ ڕاگرتنو بێدەنگی.

**★کودەتا** - Coudetat

گۆڕینی لە ناکاوی ڕژێمو ڕووخاندنی دەوڵەت بە هۆی تاقمێکەوە بۆ دەسەڵات گرتنە دەست.

**★کولێکتیڤیسم** - Collectivisme

سیستەمێکی کۆمەڵایەتیانەیە، هەوڵ ئەدات کۆمەڵ بە هۆی چەند کەسانێکەوە بەڕێوە ببات.

**★گوبینیسم** - Gobinisme

بیروباوەڕی "جۆزیف گوبینو" یە (١٨١٦-١٨٨٢) کە بڕوای بە یەکسانیبوونی ڕەگەزەکانی ئادەمیزاد نەبوو.

**★لیگالیسم** - Legalisme

بڕوای بە ڕەسەنێتیی یاساو مافی ئادەمیزاد هەیە.

**★لیبرال**- Liberal

ئازادیخواز، ئەوانەی ڕێبازی لیبرالیزم بەڕێوە ئەبەن.

**★لیبرالیسم** - Liberalisme

فەلسەفەی ئازادیخوازی، ئەو بیروباوەڕەیە کە ئەڵێت مرۆڤ بە ئازادی لە دایکبووەو خاوەنی ویستو ئارەزووەو پێویستە ڕێگە بدرێت —ئەوەندەی کە ئەکرێت— ئازاد پەروەربێتو بە ئازادی پەروەردە بکرێت.

**★ماتەریالیست - Materialist**

مادی، ئەوانەی لەسەر باوەڕی ماتەریالیزمی ئەڕۆن.

**★ماتەریالیسم - Materialisme**

مادە پەرستی، مادییەتو ڕەسەنێتیی مادە.

**★ماکیاڤیلیسم - Machiavellisme**

بیروباوەڕی ماکیاڤیلیزم کە بە فەلسەفەی ستەمو زۆرداریی تازە ناوبراوە.. بریتییە لە کۆمەڵە یاساو ڕەوشتێکی ماکیاڤیل، فەیلەسوفو سیاسەتزانی ئیتالیایی سەدەی پازدەیەم، کە بۆ حوکم کردن بەسەر خەڵکدا دایناوە. کە ئەمەش یاساو ڕەوشتێکی زۆردارانەیە.

**★میتینگ - Meeting**

کۆبوونەوەی خەڵك بۆ گفتوگۆکردنو ڕا دەربڕین لە بارەی مەسەلە کۆمەڵایەتییەکانەوە.

**★میترۆپۆل - Metropol**

ئەو کیشوەرانەی کە وڵاتی ژێردەستە کراویان بە دەستەوەیە.

**★مۆبۆکراسی - Mobocracy**

حکومەتی نەخوێندەوارەکان کە بە زۆری لە کاتی گێژاوە گشتییەکاندا دروست ئەبن بە شێوەی کاتی.

**★مرکانتالیسم - Mercantalisme**

بیروباوەڕێکە ئەڵێت هەر نەتەوەیەك کاتێك ئەتوانێت لە ڕووی ئابوورییەوە بەهێز بێت کە ڕادەی ئەو کەلو پەلانەی ئەی نێرێتە دەرەوە لەو کەلوپەلانە زیاتر بێت کە لە دەرەوە ئەی هێنێت.

**★مونارشی - Monarchie**

حکومەتی پاشایەتی، سەڵتەنەتی. بەو دەوڵەتە ئەڵێن کە لە لایەن تاکە کەسێکەوە بەڕێوە ببرێت بە شێوەی میراتگریانە.

**★میلیتاریسم - Militarisme**

بەوانە ئەڵێن کە لەو باوەڕەدان جەنگو ئامادەبوون بۆ حاڵەتی جەنگ پیرۆزترین ئەرکی سەرشانی دەوڵەتو گەلە.

**★ناسیونال - National**

نەتەوەیی.

**★ناسیۆنالیسم - Nationalisme**

بیروباوەڕی نەتەوەییانە، نەتەوەپەرستی، ڕێزگرتنی نەتەوەیەك بەسەر نەتەوەکانی ترا، وەفاداریی تەواو بەرامبەر بە نەتەوەی خۆی، ڕێزگرتنی نەریتو یاسا نەتەوایەتییەکانی نەتەوەی خۆی بەسەر نەتەوەکانی تردا.

**★ویگیسم - Whiggisme**

ناونیشانی ئاشکرای حزبی ئازادیخوازی بەریتانیایە کە تاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم بەو ناوە ناو نرابوو.

**★هیومنیسم - Humanisme**

جۆرە فەرهەنگێکە کە سەر بە ئامۆژگای کلاسیكو کۆن بێت.

**★یوتیلیتاریانیسم - Utilitarianisme**

فەلسەفەیەکی سیاسییە کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا بە هۆی کۆمەڵێك لە لیبراڵییەکانی بەریتانیاوە پەروەردە کراوە، ئەم فەلسەفەیە هەموو شتێکی باش ئەخاتە تەرازووی سوود لێ وەرگرتنەوە.

**★یوتوپیانیسم**

زاراوەیەکە، لە زانستی سیاسیدا زۆر بە دیارە، وە بریتییە لە کۆمەڵگەیەکی ئایدیالی.. یان دەوڵەتێکی بێ ڕەخنە.

## دوا سەرنج


خانەی چاپو بڵاوکردنەوەی (قانع) وەکو پرۆژەیەکی ڕۆشنبیری هەوڵ ئەدات کتێبی ناوازە پێشکەش بەخوێنەرانو کتێبخانەی کوردی بکات. لەو سۆنگەیەوە هەوڵی جدی دەدەین بۆ دەوڵەمەندکردنی بزاڤی ڕۆشنبیریو زیاتر تایبەتمەندیەتی بەبابەتی وەرگێڕدراو ئەدەین، نۆبەرەی ئەم کارەشمان بەکتێبی (فەرهەنگی نوێ) دەست پێکردوە، بەو ئومێدەی ئەم کاروانی چاپکردنی کتێبە خزمەتێکی بچوك بگەیەنێت.

**ئاگر بورهان قانع**

**خاوەنی خانەی چاپو بڵاوکردنەوەی قانع**

**کانونی دووەمی ٢٠٠٣**

# ئەو وشانەی لەم فەرهەنگەدا کۆبوونەتەوە

| | |
|---|---|
| Apartied | ئاپارتاید |
| Eietilaf | ئیئتیلاف |
| Apartheide | ئاپارتهید |
| Opportunisme | ئۆپۆرتونیزم |
| Apolitisme | ئاپۆلیتیزم |
| Autocracy | ئوتوکراسی |
| Reaction | ئیرتیجاع |
| Aristocratie | ئاریستوکراتی |
| Absolutisme | ئیستیبداد–ئەپسولوتیزم |
| Exploitation | ئیستیثمار |
| Colonisation | ئیستیعمار |
| Economiepolitigue | ئابووریی سیاسی |
| Oligarchie | ئالیگارشی |
| Imperialisme | ئیمپریالیزم |
| Concession | ئیمتیاز |
| Anarshisme | ئانارشیزم |
| Indivdualisme | ئیندیڤیژوالیزم |
| Internationalisme | ئەنتەرناسیۆنالیزم |
| I-Proletarion | ئەنتەرناسیۆنالیزمی پرولیتاری |
| Revolution | ئینقیلاب (شۆرش) |
| Inquistion | ئانکیزیسیۆن |
| Humanisme | ئومانیزم |
| Ideologie | ئایدیۆلۆجی |
| Anti-Smeitisem | ئانتی سمیتیزم |
| Boycottage | بایکوت |
| Blankisme | بلانکیزم |
| Bourgeoisie | بۆرجوازی |
| B-Comprador | بۆرجوازی کۆمپرادۆر |
| Bureaucracy | بیرۆکراسی |
| Barbarisme | بەربەریزم |
| Parl | پارلمان |
| Pacifisme | پاسیفیزم |
| Proletariat | پرۆلیتاریا |
| Propagande-Agitation | پروپاگەندە–ئاژیتاسیۆن |
| Terrorisme | تیرۆریزم |
| Theorie | تیۆری |
| Technocaracy | تەکنۆکراسی |
| Totaliterisme | توتالیتاریزم |
| FifthCampaign | تابووری پێنجەم |
| Timocracy | تیموکراسی |
| Geopolitique | جیۆپۆلیتیك |
| War | جەنگ |
| Prospects | جیهانبینی |

| | |
|---|---|
| چین (گبقه) | Class |
| حزب | Party |
| خودموختاری | Self-Determination |
| دیسپۆتیزم | Despotisme |
| دۆگماتیزم | Dogmatisme |
| دیماگۆگی | Demagoge |
| دیموکراتی | Democratique |
| دەوڵەت | Republic |
| دیالەکتیك | Dialectic |
| دیپلۆماسی | Diplomacy |
| دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا | Dictature du Proletariat |
| دیواری چین | China Wall |
| ریالیزم | Realisme |
| ریفراندۆم | Referendum |
| رادیکالیزم | Radicalisme |
| راسیزم | Racisme |
| ریفۆرم | Reforme |
| ریڤیژیۆنیزم | Revisionisme |
| زایۆنیزم | Scionisme |
| ژێرخانو سەرخان | |
| سزاریزم—تزاریزم | Czarisme, Tsarisme |
| سۆشیالیزم | Socialisme |
| سانسۆر | Censeur |
| سانترالیزمی دیموکراتی | Centralisme Democratique |
| سەرمایەداری | Capitalisme |
| سکتاریزم | Sectarisme |
| سەندیکا | Syndicat |
| ستراتیجو تاکتیك | Strategieet, Tactique |
| ستالینیزم | Stalinisme |
| سیاسەت | Diplomacy |
| سیستمی هەڵبژاردن | Referendum |
| شۆڤینیزم | Chauvinisme |
| عەینیو زەینی | Objectiv, Subjectiv |
| فابینیزم | Fabianisme |
| فاشیزم | Fascisme |
| فالانخیزم—فالانژیزم | Falangisme |
| فرماسیۆنی کۆمەڵایەتی—ئابووری | Fermaciun |
| فارمر | Farmer |
| فیودالیزم | Feodalisme |
| فیدراسیۆن | Fedration |
| فابیانیزم | Fabianisme |
| ڤیتۆ | Veto |
| کۆیلەیەتیی | Escalavagisme |
| کۆماری | Republic |
| کۆسمۆپۆلیتیزم | Cosmopolitisme |
| کولتوور | Colture |

| | |
|---|---|
| **Capitulation** | کاپتیۆلاسیۆن |
| **Prolitare** | کرێکاری کشتوکاڵی |
| **Commune** | کۆمۆنی سەرەتایی |
| **Kynak** | کۆلاك |
| **Capitalisme** | کاپیتالیزم |
| **Conservatisme** | کۆنسرواتیزم |
| **Confederation** | کۆنفیدراسیۆن |
| **Latifundiste** | لاتیفۆندیست |
| **Lumpen Proletaiat** | لۆمپن پرۆلیتاریا |
| **Liberalisme** | لیبرالیزم |
| **Mobocracy** | مۆبۆکراسی |
| **Maccarthysme** | ماککارتیزم |
| **Machiavelisme** | ماکیاڤیلیزم |
| **Maltusianisme** | مالتۆسیانیزم |
| **Manifeste** | مانیفێست |
| **Metropole** | مەترۆپۆل |
| **Nationalisation** | میللی کردن |
| **Militarisme** | میلیتاریزم |
| **Nazisme** | نازیزم |
| **Nationalisme** | ناسیۆنالیزم |
| **Neocolonialisme** | نیۆئیستیعمار |
| **Production Forces** | هێزەکانی بەرهەمهێنان |
| **Production Means** | هۆیەکانی بەرهەمهێنان |
| **Humanisme** | هیۆمینیزم |
| **Uniscef-UNICEF** | یونیسێف |
| **Unesco-UNESCO** | یونیسکۆ |